کتێب : ماینەشێی ستی

بابەت : رۆمان

نووسەر : کەریم کاکە

هەڵەبڕی و بەرگ : سەرکەوت وەلی

مۆتیڤ: قەرەنی جەمیل

نۆرەی چاپ : یەکەم – ٢٠٢٠

تیراژ : ٥٠٠

نرخ : ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕکی د. لانە سەلیم چاپکراوە.

١

به تۆزی پێی دەیناسیەوە، ئەگەر لە کەژی تەڕو تووشی و بە بن باو بۆراندا هاتبا، بەو پڕووشکە قوڕانە دەیناسیەوە کە لە پێیەوە دەگەیشتنە بن هەور و لە شێوەی پەڕەمووچەی تەڕ دەکەوتنەوە سەر زەوی، ماینەشێ دەگەیشت و لە سەر دەرگا نەرم دەیحیلاند.

ئەوشەویش وەک چەند جاری پێشی بە حیلەی نەرمی ماین وەئاگاهات، هەستا، چراکەی داگیرساند، زانی دەمەوبەیانە، ئاخر ماینەشێ هەر کەڕەتێ دەرکەوتبێ، لەو کاتەی شەو بووە، قومە ئاوێکی خواردەوە، دەسرۆکەکەی لە سەر سینەی کردەوە و خستیەوە قەدی نوێنی سەر ئەستێرک، چوو دەسنوێژی هەڵگرت، لە سەر بەرماڵ بە رووێکی خۆش:

خۆش هاتی، ماینەکەم، کچەکەم، دەمێ بوو دیار نەبووی، وا بووە سێ ساڵ، دە زوو بڵێ، بزانم ئەو گەڕە چ هەواڵێکی خۆشت لۆ دایکی خۆت هێناوە؟ دیسان مزگێنیت کەوت، زوو بڵێ، توخدا زوو، نەگاتە هێوارێ.

کێ لە بیریەتی ئەو ژنە رەشپۆشە خەوناویە، لە کەیەوە تەنها بۆ خەون دەژی؟ خەوندیتن بە هاتنی ماینەوە، هەر جارێ ماین

هاتبێتە خەونی، هەواڵێکی خۆش گەیشتووە، لەو هەواڵانەی دڵی وی هێند خۆش دەکەن، دوو سێ ساڵ تەمەن دەگەڕێتەوە، هەر لەبەر هەندێشە، بە پێوە ماوە و ناکەوێ، مانەشێ تەنها کەڕەتێ بە هەواڵی جەرگبڕەوە هاتۆتەوە ئاوایی، ئەویش لە ناو نا، لە دەرێی خەون، لەوەودوا هەمیشە بە هەواڵی خۆشەوە سەری بە ماڵی ژنەی خەوناویدا داگرتووە، ژنە لە سەر بەرماڵ دەڵێ:

مانە شیرنەکەم، ئەوان چەند بوون، هێندە جارە سەربدەوە، من هەواڵە جەرگبڕەکە لەبیر دەکەم، ئێ گیانەکەم، بەلاگێڕت بم، زوو زوو وەرە، خودا چەپارەت بدات.

نوێژی لە نوێژ گرێدەدایەوە، هەر کەڕەتێ مانەشێ بێ، تا تینی هەستانەوە و چوونە کڕنووشی تێدا دەمێنێ، نوێژ دەکات، ماندوو بوو، هەر لە سەر دووگردەوە رووی بۆ لای چراکە وەرگێڕا بە پەنجە وردیلەکانی کەوتە ژماردن:

یەک، دوو.....شەش، تازە شەشە! هێشتا زۆری ماوە، ئەوان بیست کەس بوون، یان زیاتر؟ دەی خودایە، ئەو جارە ئەویان بێ، هێ لە شەشەمەکە بە هەر هەموویان هەیە، چ ئەوانەی چوون، چ ئەوانەی دەبێ بچن، نا، ئەدی سەرکارەکە! دەی مانە جوانەکەم ئەوجارە لە جیاتی درەنگهاتنت، با هاتنی حەفتەم جارت، حەفت هێندەی جاری شەشەمت دڵم خۆش بکات.

تاوی لێناکەوێ، کات چەقیە، ناچێتە پێشێ، دێتە حەوشە و سەر دەرگا، لەو شوێنە رادەوەستێ کە بەر لە بانگی سپێدە مایندەشێ لێی راوەستابوو، بە حیلەیەکی نەرم مالاوایی لێکرد، هەستی رادەگرت، لە بەر خۆوە:

دەی، لە گەڕەکی ئەو بەری، دەنگی بابە ڕۆیێ، برا ڕۆیێ.

دەی، سینگکوتان و قژڕنینەوەی...

نەبوو، نیوەڕۆ داهات و ئاوایی مینا چەند ڕۆژەیە و هیچ لە گۆڕێ نیە.

لەو سەر لۆ ئەو سەر، گوێ بە دار و دیوارەوە دەنێ، هەست و خوست لە خۆی دەبڕێ، ئێ، گۆتەیەکی خۆش، گۆتەیەک بە دڵی خۆی ببیستێ، نیە، ئاوایی قسەی خۆشی نیە، گوێی لێیە، ژنێ دەڵێ:

کوێراییم داێ، ئەو ژنە بە تەواوی شێت بووە.

گوێی ناداتێ، ئاوڕیشی لێناداتەوە، چووە بن دار تووەکەی بەر مالان، ئەوەی تەمەنی ئەوی هەیە، ڕۆژی جارێ دوو هەر دەبوو سەرێکی لێبدا و تەماشای ئەو لقە خواربۆوە ئەستوورە بکات کە

ناوی بووبووە لقی جۆلانێ، ئەو جۆلانەیەی لە هەر دیتنێ، دڵی دەکەوتە هەژانێ، چ هەژانێ! چ دەستێ جۆلانەی وا نەهەژاندووە.

ئێوارە داهات، هیچ، ئاوایی کشومات، بەرەو ماڵێ گەڕاوە، لە سەر کۆسپەی دەرکە، روو لە رۆژهەلات، لەو لایەی مایندشێی لێوە دەهات، راوەستا:

ماینە گوڵەکەم، دەترسم ئەو جارە رێت هەڵە کردبێ، بزانە نیازت کن کێ بووە، بێرەدا هاتووی، چما تۆش هەڵە دەکەیت؟ نا، هەڵە لە تۆ ناوەشێتەوە، دێ، هەواڵە خۆشەکە دێ، بەلام لەگینە دوور بێ، تا دەگاتێ دوو سێ رۆژی پێدەچێ، خۆزی وەک ئەوەی پێشوو دەبوو، گەرماو گەرم دەگەیشتە جێ.

چراکەی هەڵکرد، نانێکی تەڕکرد، جامیلکە ماستێک و نەختێ خورمای هێنا، بەدم خواردنەوە:

با زوو نانەکەم بخۆم و نوێژەکەم بکەم، نەوەک وەک جاری پێشی، لە خۆشیان بە نان و نوێژ رانەگەم.

لە سەر بەرماڵێ، روو لە ساپیتە:

خودایە، ئەو زۆردارە خوێنخوارە، بە دەردی مێردە بەرازەکەم ببەیت، بیخەیتە زێی گەورەوە، کەس تەرمەکەشی نەبینێتەوە، نا،

زێ باش نیە، گوڵلە گوڵلە، بە گوڵلە نەچێ دڵم داناکەوێ، بەر گوڵلەی جامبێزار کەوێ، بە سەر دڵ و دوڕ چاوی کەوێ، بە چاوی خۆم ببینم وەک گا لە ناو خوێنی خۆی بگەوزێ، دەی خودایە، ئەگەر بە خۆت دەڵێی دادپەروەر، ئەو خوێنەم نیشانبدە.

ژنی خەوناوی، دوای چەند نوێژێ، هەر لە سەر بەرماڵێ روو لە چراکە بە خەیاڵدا چوو، گەیشتەوە مایندشێی سێ ساڵ لەوەو پێش، کاتی هات و حیلاندی و قووچاندی و لە خەوی کرد و لە خەونێی هێنایە دەرێ و هەر ئەو رۆژە هەواڵێکی بە دڵی وی گەیشت:

+ هەشت وەسەر، زێ بردی.

– خۆ کەس نەیگرتەوە!

دەیبیست دەیانگۆ:

لە دیرۆکی ئاوایی، دیرۆکی کۆن و نوێ، نەبووە ژنێ هەبووبێ، بە مردنی مێردی خۆی وا دڵخۆش و شاگەشکە بووبێ.

لە بن لێوانەوە:

خۆزی زووتر، زۆر زووتر، ئەو بەرازە ئاو دەیبرد، نەخشە بێ لە ژنی ئاغاش.

کاتێ تەرمەکەیان هێنایەوە، بیریکەوتەوە کە گوتبووی:

نەدەبوو، بیگرنەوە، نەدەبوو گۆڕی هەبێت، ئەو بۆرەپیاوە خاک بۆگەنی دەکات.

لەو رۆژەوەی ناشتیان تا ئەو شەوەی وا بەبیری هاتۆتەوە، یەک کەڕەت چۆتە سەر گۆڕەکەی، کردە و گۆتەی سەر گۆڕی بیرکەوتەوە، لە لای سەریەوە سێ چوار پێلەقەی لێدا و گوتی:

تۆ پیاوێکی بێ دڵ بووی، نا، پیاو نا، بۆرەپیاو بووی، پیاوی ئاغا بووی، منیش ژن نەبووم، ئەگەر ژن بام، ئەو هەموو ساڵە چۆن لەگەڵ تۆ هەڵم دەکرد، منیش ژن نەبووم.

ژنەی خەوناوی هەر لە سەر بەرماڵێ بە خەیاڵ گەیشتەوە ئەو ساڵ و رۆژەی کە ماینەشێ بێ سوار گەیشتەوە ئاوایی و هەواڵە جەرگبڕەکەی هێنا و هۆن هۆن فرمێسکی بە سەر دوو جەرگسووتاودا دادەباراند، بیریهاتەوە، گۆتیە مێردەکەی:

+ من ئیدی ژنی تۆ نیم، سێ بەردەم لە دەست بنێ و دەڕۆم.

– ئەوە نابێ، بۆ هیچ کوێ ناچی.

+ لەوڕۆوە تا مردن، دەستت بە دەستم بکەوێ، وا دەکەم هەردووکمان وێکڕا بمرین، هیدڵیمە و تێبگە...

ئەو هەموو ساڵە رابرد، ژنی خەوناوی رێی نەدا مێردەکەی بێتە ناو جێی، لە یەک ماڵ وەک دوو نەیار ژیان و کەسیش بەوەی نەزانی.

ژنەی خەوناوی گریانی شەوانی مێردەکەی بیرکەوتەوە، دوایوەی پەژیوانی دایگرت، شەو نەبوو بۆ تاوێ هۆڕهۆڕ نەگریێ، گریانێ بەردی دەتاواندەوە، بەڵام ژنەی خەوناوی بزەیەکی تاڵی بۆ دەکرد و بە کڕی هۆدەکەی بەجێدەهێشت و دوای کڕبوونەوە دەهاتەوە، ژووریێ، بیریەتی کەڕەتێ بە تیزەوە پێیگوت:

سوارچاک، بۆ نەبەردیەکەی خۆت دەگرییێت، بیرتە وەک ئەوەی لە شکری عارەبانت تێکشکاندبێ، وا سەربڵندانە هاتیەوە ئاوایی؟!

چاوەڕێی وەلامی مێردەکەی نەکرد و دەرپەری.

ژنی خەوناوی لە خەیاڵ گەڕایەوە، هاتەوە سەر بەرماڵ، شەو راشکاوە، زۆر درەنگە، حەپەی سەگیش نەماوە، هەستا، دەسرۆکەکەی لە قەدی نوێنان دەرهێنا، جوان تەماشای کرد، تاوێ خستیە سەر چاوی، بە سنجاقە گچکەکە لە سەر دڵی خۆی گرێیدا، فووی لە چرا کرد و چووە سەر جێ.

هۆدە تاریک دانەهات، مانگ لە کولانکەوە چەپکێ رووناهیی بۆی نارد، ئەوەتا، لە سەر تەنیشت راکشاوە، روومەتی چرچی کە هێشتا جوانیی سەردەمی جوانیی پێوە دیارە، خستوویەتیە سەر

لەپـــی چەپـــی و بە دەنگێکـــی ناســـک و نەرم وا لەگەڵ ماینەشـــێ دەئاخڤێ:

ماینەکەم، کچەکەم، بە گۆری یال و حیلەت بم، بەڵاگێـڕی نـاڵ و سمت بم، لە دەوری هەناسە و هەڵمـی زارت گەڕێـم، ئەگەر دەزانـی شـەوی چـووی بە هەڵە هـاتی، ئەو شـەو وەرەوە و پێمبڵـێ و لەو دڵەکوتێیەم دەربازکە، باشە، کچە نازدارەکەم، بەڵام ئەگەر راسـتە، خۆت ماندوو مەکە، ئەو رێـیە دوورە مەبـڕە، دەزانـم راسـتە، تـۆ بە هەڵە نایەی...

ژنی خەوناوی خەو دەیباتەوە، بەڵام لە قسە ناکەوێ، پچڕ پچـڕ، هەر ئەوەتا دەیبیستی، لە هەموو نا، لە هەندێ رستەی تێدەگەی:

نا، کچەکەی من هەڵە ناکات، دێت، سبەی، ......، برایمۆک...... خوێنی...... یان سەرکارەکەیە ....... ماینەشێ ........ درۆناکـات، هەڵە ......

مانگ بەر کولانکەی بەر دا، ژنی خەوناوی لە تاریکی بزر بوو، نە دەنگی ما نە رەنگی.

٢

**ماڵی وان یەک یەک، دوو دوو**

**سەر نێن لە هەشێ**

**لە خەونێ من پڕ خۆش بوو**

**حیلەحیلی ماینێ شێ**

تـــاو دەمـــێکە کەوتـــووە، تیشـــکی ڕۆژێ لە کـــولانکەوە وە ژۆر کەوتـــووە، هەرگیـــز وا درەنـــگ لە خەو ڕانەبـــووە، بە پەکـــوو پەکـــوو، ڕایەخەکەی دەقکـــرد و خســـتیە ســـەر ئەســـتێرکەکە، دەســـرۆکەکەی خستەوە قەدی نوێنان:

پەکوو، ئەوە لۆ؟ نوێژەکەشم چوو.

بە بیری نایێ نوێژی سپێدانی چووبێـت، مـاینەکەی بیـرکەوتەوە، لە بن لێوانەوە:

دیـارە ڕاسـتە، لۆیێ نەهـاتەوە، دەنـا دەهـاتەوە، لە قسـەی مـن دەرنـــاچێ، ئەوڕۆ دەگـــات، هەواڵە خۆشـــەکە دێـــت و گەڕەکـــی ئەو سەری دەتاسێنێ، بینێرە، بینێرە، خودایە، زوو بینێـرە، تـا بە خـۆم بچمە مـــاڵی زرێـــخ و مزگێنـــی دەمـــێ، ئەوە ببیســـتێ بە ســـەر پـــێ دەکەوێتەوە.

بە پەلە پەل تیکە نانێکی خوارد و دەرکەوت و بن دیوار بن دیوار، سەر دەرگا سەر دەرگا دەڕۆیشت و گوێی هەڵدەخست، بۆ ئەو هەواڵەی دەیویست، هەر ژنێکی دەدی دەیپرسی:

هیچ، نەبووە، هیچتان نەبیستووە؟

هەندێ ژن بە واقوڕماوی و هەندێک بە چاوی بەزەیی لێی ورد دەبوونەوە، هەشبوو وەڵامی دەدایەوە:

نا، شتی وەک چی؟

دەڕۆیشت و وەڵامی کەسی نەدەدایەوە و هەر دەیپرسی:

بە من بڵێ، ئەوڕۆ چ ڕووینەداوە؟

ژنێک گوتی:

ڕۆژ هەیە هیچ نەقەومێ! حەرەس قەومی، بە ناو وەربوونە، کەسیان هێشت؟!

ژنی خەوناوی:

گوو بە حەرەس قەومی، من هەواڵی خۆم دەوێ.

دەمە دەمی نیوەڕۆیە، لە بن دارتووەکە بە دیار لقی جۆلانەوە دانیشتووە و دڵی دەڵێی جۆلانەیە، دەچێتە حەواو دێتەوە، ژنێک لا دەداتە لای و دەڵێ:

دەڵێی دڵت تریواندبووی، شتێ دەقەومێ؟

بە تاسەوە، هێندەی نەمابوو بچێتە ناو دەمی:

بڵێ، چ بووە؟

ژنە بە خەمبارییەوە:

ماڵی ئاغا گۆیندەیەکیان کوشتووە.

ژنی خەوناوی وەک ئەوەی جامە ئاوێکی ساردی پێدا بکەن، رووی وەرگێڕا:

گۆیندە بە من چی، ئەوەش هەواڵە!

ژنەکە:

ئاخر، بۆ ناپرسی، لە سەر چی کوشتوویانە؟

ژنەی خەوناوی وەک لەگەڵ ئەویشیان نەبێ، چاوی بڕیەوە لقی جۆلانە و دڵی کەوتەوە جۆلانێ.

ژنە لە سەری ڕۆیی:

ئەو گۆیندەیە لە دانیشتنێک، حەیرانێکی وای بە سەر ماینەشێ و ئەواندا گوتبوو، تا ئێستا کەس وای نەگوتووە، چەند ئاوایی گریاندووە...

ژنەی خەونـاوی بزەیەکـی تـاڵی کـرد و چـاوی لە لقـی جـۆلانە نەکـردەوە، ژنە گـوێی نەدایە بە هەنـد وەرنەگرتنـی وی، درێـژەی دایێ:

لەو حەیرانە، ناوی ئاغای هێناوە و شرتوشۆی شکاندووە، دەڵێن لە سەر هەندێ، چوونە کوشتوویانە.

ژنەی خەوناوی هەستا، بە دەم رۆیشتنەوە:

من چاوەڕێی هەواڵێکی خۆش بووم، هەواڵێکی وا شایی دابەستم و سەرچۆپی بگرم.

یەکپێ، تا سەر دەرگای ماڵێ گیر نەبوو.

لە سـەر چیچکـان روو لە رێـی ماینەشـێ دانیشـت، پەنجەکـانی هەردوو دەستی تێکپەڕاند و خستنیە بن چەنەگەی، سەر بادەدات و هەناسەی وا هەڵدەکێشێ، ئاشیبا لە بـن دێنـێ، پێـدەچێ دڵـی پـڕ قسـە بـێ، بەڵام نەزانـێ لە کوێـوە بـۆ کـێ هەڵیرێـژێ، تەواوێ بەو شێوە دەمێنێتەوە، پێی شل دەبێت، دەست بە دیـوارەکەوە دەگـرێ و هەردەستێتەوە، بە گۆدە گۆد دەچێتەوە ژۆرێ، رادەکشێ لە سەر چـاو دەکەوێ، پـاش کەمـێ بە دەنگـی بەرز دەکەوێـتە قسـە، لە حەوشەوە گوێت لە دەنگی دەبێ:

ماینەکەم، کەحێلەکەم، چمـا فێـر بـووی هەواڵـی ناخۆشـیش بـۆ دایکی خۆت بهێنی! بە مـن بڵـێ کـێ فێـری کـردی؟ نەدەبـوو ئەوە لەگەڵ من بکەیت، گەردنت ئازاد ناکەم، من چاوەڕێی چی بووم، تۆ

چیت هێنا، مەرگی گۆیندەت هێنـا، ئەو گۆینـدەی بە حـیلە و بڕ و ڕەوهانیی تۆی، بە سەر ئەوانیدا هەڵگوتووە، چۆن ڕووت هـات، بەو هەواڵە تاڵەوە بەو دەمەو بەیانە لە دەرگای من بدەیت!

لە تاوا خەوی هات، هێزی هەستانەوەشی نەبوو، تـا دەسـرۆکەی خەوێ لە قەدی نوێنـان بێنێـتە دەرێ و بیخـاتە سـەر دڵـی، بـێ دەسرۆکەش خەو نایە، ئەگەر حەفتەیەکیش خەو نەچووبێتە چاوی، زۆری لە خـۆی کـرد، هەسـتاوە، نەگەیشـتبووە لای ئەسـتێرک، دەنگێک:

ئەرێ ژنێ، تۆ کەوتیە ناو بیرێ! لۆ دەنگت نایێ؟

ناسیەوە، بەڵام باوەڕی بە گوێی خۆی نەکرد:

نابێ هەو بێ، ئەدی لە پێ نەکەوتووە!

وەکات هێز بۆ پێی گەڕایەوە و بە ها ها، دەرپەڕیە دەرێ:

ئەوە تۆی زرێخ؟

دەسـتێ بە دیـوار و دەسـتێ بە گۆچـانەوە، بە هەناسـەبڕکێ و ڕووێکی گەشەوە:

منم، ئا منم، نەتزانیوە، چ بووە؟

ژنی خەوناوی: نا، چ بووە کچێ؟

زرێخ:

دیارە لەو شەوانەماینەشێ مێوانت نەبووە!

ژنی خەوناوی:

با، بەڵام...

زرێخ:

گوێت لە شین و واوەیلا نیە، ئاغا من و تۆ خۆش.

ژنی خەوناوی:

بڵێ بە قورئان!

زرێخ:

بە سەد قورئان، دەی دەستم بگرە با بچینە ژوورێ.

ژنی خەوناوی بە پێخواسی فڕکەی کرد، بە دەم هەڵاتنەوە:

زرێخ تۆ دانیشە، هەوکە دێمەوە.

دەتگوت پێڵاوی بای لە پێیە، هەر هێندەی تا حەفت بژمێری گەیشتە گەڕەکی ئەوسەری، لە سیلەی خانووێکەوە چاوی دایە پێش دەرگایماڵی ئاغا، تا چاوی تێر بوو هەڵینەگرت لە سەر سینگکوتان و پرچ رنینەوەی ژن و کچانی ئاغا.

لە گەڕانەوەدا بە دەنگی بەرز:

خودا، له چاکەت دەرناچم، ماینەکەم، کچە جوانەکەم، ئەمن دەمزانی تۆ هەڵە ناکەیت، دەمزانی کاتێ دێیت، هەواڵی لە هەنگوین شیرنتر لە گەڵ خۆت دەهێنی، ئەورۆ بیست ساڵ منت جوان و جحێڵ کردەوە، چیدیم لە تۆ ناوێ، نا، نا، سەرم لێمەبڕە، هێشتا سەرکارەکە ماوە، زۆریان ماون.

لە سەر دەرگاوە:

کچێ زرێخ، هەستە شایی بگێڕین.

زرێخ:

دانیشە، خۆشیەکەمان لێ تێکمەدە، ئەوانە ئێستا هاربوونە، کەر بە دەنگی گەورە بزەڕێ دەیکوژن... ئەگەر دەرمانچا و شەکرت هەیە چایەکی لێنێ، دەمێکە هەر بە قەسپ دەیخۆمەوە.

ژنی خەوناوی بە پرتاو بەرە و ئاگردانەکە دەچێ و قشپل دادەگیرسێنێ:

هەمە، لۆ ڕۆژێکی وەک ئەورۆم هەڵگرتبوو.

ئێستا دوو ژنی سەرتاپا رەشپۆش بە دەم چاخواردنەوە، بە ڕوویکی خۆشەوە گفتوگۆیانە، جاروباریش ئاخی قووڵ هەڵدەکێشن، هێند قووڵ ئەگەر بە گەزی ساڵ بیپێوی بیست ساڵ قووڵ.

نەنە زرێخ دەپرسێ:

ئەرێ لەوێ پێنەکەوتی، داخوا مردنەکەی کوکوویی بووە؟

ژنی خەوناوی:

نا، بەڵام هێندە تێگەیشتم، کوژراوە.

نەنە زرێخ:

ئۆخەیش، هەرکێ کوشتبێتی، دەستی کەسک دەبێت، تۆ بە من بڵێ، بۆچی زوو لە هاتنی ماینەکە ئاگادارت نەکردمەوە؟ تا خۆم بۆ خۆشیەکە ئامادە کردبا.

ژنی خەوناوی:

چووزانم، گۆتم نەبادا ئەو جارە بە هەڵە هاتبێ، دامنا بوو، لەگەڵ گەیشتنی هەواڵەکە من بێم مزگێنیت بدەمێ.

نەنە زرێخ:

ماینی تۆ هەڵە ناکات، ئەو جارە هەر هات، بەر لەوەی تاو بکەوێ، دێی بە من دەڵێی.

لەو دەمە کورپێژگەیەکی کەڵەگەتی گەنم رەنگی چاو و برۆ رەش هاتە ژوورێ، نەنە زرێخ بۆ تاوێ هەناسەی گیرا، چاوی زەق بۆوە، لە بەر خۆوە:

وەی خوایە، چەند لە مامی دەچێ.

بیست و چەند ساڵێ گەڕاوە پاشێ، کوڕەکەی کتومت ئەو کوڕەزایەی بوو.

وەرە هاوڕێ، وەرە داستاننووسەکەم، دانیشە بزانم...

کوڕە دانیشت و بە زاری تژی لە بزەوە:

نەنە زرێخ، تەرمەکەشی هاتەوە، نەیانهێشت کەس سەری بە سەردا بگرێ، دەڵێن وەها شێواوە، ئیزرائیلیش نایناسێتەوە.

هەردوو ژنە پێکەوە:

وەی خودایە، لە تۆ بە زیاد بێ، نەتزانی کێ کوشتوویەتی؟

کوڕە بە دەنگێکی نزم:

دەڵێن لە شەڕی پێشمەرگەدا کوژراوە، دەچم جوان پێدەکەوم و بزانم لە کوێ و چۆن و کێ...

دەرپەڕی، ژنەی خەوناوی روو لە زرێخ:

دوو سێ جاریدیش پێمگۆتی، من زۆر خۆشیم لەو کوڕەزایەی تۆ نایە، خۆزگە ئەو ناوەشتان لێ نەنایە، دەڵێن لەگەڵ خوارزایەکی ئاغا زۆر دۆستە، حەیف، خوێنی مامی خۆی لەبیر کرد، نازانم چۆن ئەو (هاوڕێ)یەی لێ وەرگرمەوە، باشە ئەو داستاننووسەت لە کوێ پێوەکرد!

زرێخ:

کچێ، تۆ لۆ تێناگەی؟ ئەو خوارزایەی ئاغا نەچۆتەوە سەر ئەوان، زۆر هاوڕێی هاوڕێیە، لە خوێندنێ پێکەوەن، سڕ و تڕی ئاغا و ئاغایەتی هەموو بە گوڕێ وەردەکات، دەڵێن بەگەڵ سۆرەکان کەوتووە و دوژمنی بابە کوشتەی ئاغایانە، خۆ بابیشی دەمێکە پساغایە و ئاغا نیە، ئەو کوڕە هیچ لە هاوڕێ ناشارێتەوە، زۆر لە ماڵی خۆیان و ماڵی ئاغا بێزارە، ئەو برازایەی منیش دەمێکە لە گژە داستانەکە بنووسێتەوە، بۆیە ئەو ناوەم لێناوە.

ئەو شەوە ژنەی خەوناوی لە خۆشیان خەوی لێنەدەکەوت، دەسرۆکەی خەوێش خەوی نەهێنا، بۆنی دەکرد و بە سینگی خۆیەوە دەنا:

کچم، حەزدەکەم زوو بتگەمێ و ئەو هەواڵە شیرنەت بدەمێ، کچم ئێستا هێندەی سەرە دەرزیەک لە مردن ناترسم، خۆ ئەگەر یەک یەک مەرگی ئەوانیدیش ببینم، بە بێ گازکردنی ئیزرائیل، دێمە لات.

ژنی خەوناوی، خەوی نەدەهات، کەلەکانی دەگۆڕی، هەڵدەستاوە و رادەکشا، دەسرۆکەی توند بە سەر دڵی خۆیەوە دەنا، خەو نەدەهات و نەدەهات، بیری لەوە دەکردەوە چۆن بچێتە سەر گۆڕی ئاغا و چی پێبلێ، وشە وشە رستەی رێکدەخست، دەیگۆڕی و جێگۆڕکێی پێدەکردن...

نوێژی ئەو بەیانیەشی چوو، تیشکی کولانکە وەئاگای هێنا.

٣

ژنی خەوناوی ڕێی گۆڕستانی گرت، هێشتا هەر لە ناو ئاوایی بوو، هەڵوەستەیەکی کرد، سێ پەنجەی بیرکردنەوەی خستە بن چەنەگەی:

نا، ئێستا باش نیە...

ڕێ و ڕێ گەڕایەوە، لە ڕاستی دارتووەکە کەمێ ڕاوەستا، لای نەدا، ڕێی ماڵی نەنە زرێخی گرت.

زرێخ:

نەهاتبای، دەهاتم.

ژنی خەوناوی:

تەواو پێکەوتی؟

نەنە زرێخ:

دانیشە، تا ورد و باریک بۆت بگێڕمەوە.

نەنە زرێخ هەرچی خۆی دەیزانی، هەرچی لە داستاننووس بیستبووی و ئەویش لە خوارزای ئاغاوە، خوارزاش لە دەست و پێوەندەوە زانیبووی، بە دڵ و داو بۆ ژنی خەوناویی گێڕایەوە:

+ بە خۆت دەزانی ئاغا بووەتە جاش و بە پێش عارەب و حەرەس قەومیان کەوتووە.

- ئەوجا ئەوڕۆیە جاشە؟ هێمان ماینەکە جوانوو بوو، نەبووبووە نۆما، ئەوانە بە عارەبیان هەڵدەگۆ.

+ ئا،ئا، هەر ئەو نا، زۆری ئاغای ئەو دەشتە، ئەدی لە کۆنیش پیاوی ئۆسمانی نەبوون، هەر لەو سۆنگەوە بوونە خاوەن ئەو هەموو گوند و زەوی‌وزار و مەڕ و ماڵاتە، ئەو جا بۆوەی هەر وا بمێننەوە و لە دەستی نەدەن، هەر پاشا و سەرۆکێ هاتبێتە سەر تەخت، چەپڵەیان بۆ لێداوە و چەکیان بۆی هەڵگرتووە، ئێ، ئۆجا تۆ لەوە گەڕێ.

- بە من بڵێ لە کوێ کوشتیان؟

+ ئۆجا تۆ قسەم پێ مەبڕە.

ئاغا بە خۆو جاشەکانیەوە، پێش وەلەکە عارەب دەکەون، لەو گوند بۆ ئەو گوند، دەکەونە تاڵان و بڕۆ، دەگەنە ئەودیوی هەولێرێ، ڕۆژی پێش کوشتنێ، جاشەکی ئاغا کە ئێستا بریندارە و دەڵێن لە سەر مردنە، بە ئاغای گۆتیە:

ئاغام، خەونەکی زۆر ناخۆشم بە تۆوە دیتووە، بە قسەم دەکەی با خۆ بدزینەوە و نەچینە شەڕێ، بە خودای رەحمەتە، بگەڕێینەوە...

ئاغا بە قۆنداغە تفەنگان وەریگەڕاوەتێ:

ترسـنۆک، نـاکەس، دەتەوێ بە خەون بمترسـێنی! ئەگەر سـوڕ بـزانم دەکـوژرێم نـاگەڕێمەوە، دەتەوێ واز لە چەکـداری بهێـنم، تـا هەرچـی هەمە لە دەسـتم بچـێ، ئاغـایەتی لە دەسـت بـدەم و وەک تـۆی کەڕە کرمـانج بـژیم! گـوێم لەو قسـەیە ببێـتەوە، بە دەردی کابرات دەبەم.

- زرێخ مەبەستی لە کابرا، گۆیندەکە بووە، یان...

+ نـازانم، کـێ دەزانـێ! رەنـگە... ئـێ، لەوە گەڕێ، شـەڕ کەتە ئاقـارێ، ئاقـاری پشـت شـاری، جێیەکە شـاربزری دەڵێنـێ، پـێش ئەوەی بگەیتە بن زوورگەکان، دەڵێن بەر لەوەی بۆ شـەڕ دامەزرێـن و تەقە دەسـتپێبکات، پیرێژنێـک لە دوورەوە لە نـاو تـرومبێلەوە، دیارە برایمۆکی ناسیوەتەوە، روو لە ئاسمان سینگی خـۆی دادڕیـوە و بە دەنگی بڵند:

ئەگەر خـوایەتی دەزانـی، ئەو گـورگە زار بە خـوێنە، لە خـوێن بگەوزێنە، کەس بە سەری رانەگات، شیوەن بخە ناو ماڵ و منداڵی.

- ژنێ، ئەوە خوشکەکەت نەبوویێ؟

+ جارێ نازانم، ئێ شەڕە، هەر جاشە و گوللە بە قوونی دەکەوێ و دەکشێتەوە و هەڵدێ و دەکەوێ، ئاغاش گوللەیەک دەگـرێتەوە و وەک گا دەبۆڕێنێ...

- خۆزی لە کونێکەوە چاوم لێدەبوو، گوێم لە بۆڕەی دەبوو.

+ پێشمەرگەیەک بەر لەوەی دەستڕێژێکی پێوە نێت، ناسیویەتیەوە و بە دەنگی بڵند کە جاش و سەرباز گوێیان لێدەبێ:

بگرەوە، هەی تەرەس، جاشی ناکەس، حیزی حەرەس قەومی، بیرت دێتەوە بەر لە بیست ساڵ لێرە چیت قەوماند؟

دەزانی خۆت داوەتە پەنای چ کەڵەکە بەردێ؟ ها، بگرەوە.

ئاغا دەیەوێ بپارێتەوە، رێنادا، دەستڕێژی لێدەکات و دەیکاتە سەرەند و بێژنگ.

- دەک لە دەوری دەست و تفەنگت گەڕێم، لە کوێی، تا بێم خۆڵی بن پێت بە لێو هەڵگرمەوە.

+ ئەوجا دەزانی شوێنی لە خوێن گەوزینەکەش رێک شوێنی بەهەشتیانە.

- بن کەڵەکە بەردەکە؟

+ ئا، حەفت شەقاو واوەتر.

هەردووکیان وەک دوو کۆتری ماندوو سەریان بە سەری یەکتر کرد و دەستیان بە گریان کرد، نەرم نەرم بگری بگری، فرمێسک رانەدەوستا، وەک بلێی بە گریان بە هووردە رۆندکان بیست ساڵ بگێڕنەوە.

ژنی خەوناوی هەستا:

من وا دەچمە دیداری برایماغا، بیست ساڵ قسەم هەیە، ئێستا گوێم بۆ رادەدێرێ.

چاوی داستاننووسیش ماچ دەکەم، من بە هەڵە تێیگەیشتبووم، دوایی بینێرە لام.

رۆیی، لە لای دارتووەکەوە دایەوە ئەو بەری چۆمەکە، لەوێوە گۆڕستان و دارتووەکە و ماڵێ ئاغای جوان لێوە دیارە، دەتگوت رەوەیێ قەلە رەشکە لە حەوشەیان نیشتۆتەوە، ورد و درشت، رەشپۆش، لەو دوورەوە دەستی هەڵشەقاند، بە دەنگێک هەر خۆی بیستی:

دەچمە لای ئاغاتان، ژنینە، ئێوەش وەرن، گوێ لە بیست ساڵی من بگرن، گوێ لە داستانی ماینەشێ بگرن.

دوو سێ هەنگاوی نا، هەڵوەستەیەکی کرد، گەڕایەوە:

نا، ئەورۆ باش نیە، سبەی دووەی دەچم.

٤

ئەگەر لە زگی خۆم نەبا، ئەگەر جگە لەو بەرازە چ پیاوێکیدی دەستی بە دەستم کەوتبا، منیش دەکەوتمە گومان، وەک ئەو خەڵکە دەکەوتمە گومانەوە و دەکەوتمە قسە هەڵبەستن و ناتۆرە، دەمگۆ:

ئەو کچە داخوا لە کوێ هەڵگیراوەتەوە، لە کێ دزراوە، دایکی داخوا لەگەڵ ئاغای چ جێیێ سەرجێیی کردووە، ئەوەش رێ ی تێدەچوو، زۆر هەبوو باوەڕی دەهات، ئەوە نەبوو، ئاغا پیرە سەیەکەی ئەو دیوی ئاشیبا لە کرمانجان توورە دەبوو، دەینەڕاند:

نیوەی گەورەکانتان لە منن، نیوەی منداڵەکانیشتان لە کوڕەکانم.

بەرازەکەش بەینێ لێم کەوتە گومان، تا یەک دوو مانگ هەر لێی موورڕ دەبۆوە و لێی نزیک نەکەوتەوە، دوایی باش بوو بیری کەوتەوە کە نەنکی ژنێک بووە لە جوانی و شۆخی لە قاف و تەتەرستانیش هاوتای نەبووە، هەزار شەڕە تفەنگ و شەڕە خەنجەری لە سەر کراوە، ئەوجا لە باوەشی کرد، بە نەنکەکەم گازی کرد و هەر ئەویش بە ناوی نەنکیەوە ناودێری کرد، منیش وەک وی تا درەنگیش گازمدەکرد:

نەنکە ستی.

هەر لە حەفتەی یەکەمەوە جوانیەکەی دەرکەوت، ئەو جوانیەی بەو دەردەی برد، خۆزی لە خۆزیداران، لە شێوەی بەچکە مەیموون دەهاتە دنیایێ، خۆ بۆم دەژیا و پێی دەژیام، تۆ ببینە، جوانی چ بەلایەکی پێوەیە، چیت بە سەر دێنێ!

ستیی من چەند جوان بوو، سێ هێندە ژیر، چەند ژیر بوو، سێ هێندە سەرکێش، دڵی چی ویستبا، ئەوە بوو، لەوە نازانم بە کێ دەچوو! هەر دەشتی بە بڕشتی کەندێناوە نا، چ دەشتەک لە تەمەنی، کچی وا، گوڵی وای لێ نەڕسکاوە، هەر قەرەچووخی سەر بە تەم نا، چ چیایەک لە چ لاوە، کچی وای پێدا هەڵنەگڕاوە، مەگەر تەنها مایینەشێ، بە حیلەی خۆی سەرکێشیی ستی من بگێڕێتەوە، کچەکەی من لە منداڵیەوە وابوو، لەو دەمەی سەرپێکەوت و قامیشی درێژی دەکردە ماین و بە دەوری گۆمە شینی پشت ماڵان دەسووڕایەوە، تا ماینە شێ بردی، سەرکێش بوو.

ستیی من شیرن بوو، لە توو شیرنتر، هەرکێ دیتبای، بەو با، خواردبای، ژەهرت بە دیار ئەوەوە فڕکردبا، دەبوو هەنگوین، کاتێ لە سەر جۆلانێ حریت حریت پێدەکەنی، لە زاریەوە هەنگوین دەتکا، بڕۆن لە دارتووەکەی بەر ماڵان بپرسن، بزانن راوەشانی ئەو یان پێکەنینی ستی من زاری گوندیان شیرنتر دەکرد.

ستیی من زوو، بستێ منداڵ بوو، هێشتا ماینەشێ نۆما بوو، پشتی نەگرتبوو، وازی لە ماڵی ئاغا هێنا و گوتی:

بمکوژن و بمبڕن، چیدی کارەکەری ناکەم.

بە منیشی دەگۆ:

+ دایە واز بێنە، چیدی نانیان لۆ مەکە.

- چ بکەم کچم، نانەکەمان لەوە دایە.

ستی بە گژ بابیشیدا چوو:

+ بابە، بۆچی تۆ تفەنگچی ماڵی ئاغای؟

- ئەوجا چیە نەنکە ستی! ئەو کارە بە دەست کێ دەکەوێ؟

+ باش نیە، وازی لێبێنە.

- کچەتیو، کێ ئەو قسە هیچانەی فێرکردووی؟ جارێکیدی نەیبیستمەوە.

+ کەس، بە خۆم دەزانم باش نیە.

- دێڵە سەگ، لە بەر چاوم بزر بە.

+ دێڵە سەگ نیم، من ستیم.

دەستیم نەگرتبا، بابە بەرازەکەی چینە لێدانێکی باشی بۆ دەکرد، کچی من سەری وەک سەری ئاشیبا بڵند بوو، بۆ کەسی دانەدەهێنا.

ستیی مـن دڵـی گەلەک بـاش بـوو، بە سـۆز و میهرەبـان بـوو، زانیبـای منـداڵێ حەزی لە خواردنێـک لە شـتێکە و دەسـتیناکەوێ، دەچوو بەشی خۆی دەدایێ.

کچی من پاک بوو، لە مریەمی داکی عیسـا پـاکتر، بە پـاکیزەیی گەیشتە بەهەشت.

ژنە خەوناویی دایکی ستی، بابی کتێبێ قسـەی لە دڵە، بەڵام وا دیارە بۆی نایێ و نازانێت لە کوێوە دەستپێبکات، دەڵێ:

+ کورِم داستاننووس، چی دەڵێم ئەوە بنووسە، نەیگۆڕی، بەڵام قەینا هەندێکی ڕێکبخە، من لە خۆشـیان قسـەم بـۆ نـایێ، هەرچـی بکەم، ئەوەی زار دەیڵـێ، ئەوە نیە کە دڵ دەیخوازێ.

- تۆ لەوە بێ خەم بە.

٥

بـابی وی، کەم، زۆر کەم ژیـا، زوو بـۆ خەم و کـولی دنیـایێ بەجێیهێشـتین، بە بێوەژنکۆشـی دوو سـەرکەوبنکەم بەخێـوکرد، دایکـت بمـرێ، تـا منـداڵ بـوون، جلکێکیـان بە دڵـی خۆیـان لەبەر نەکـرد، پێڵاوێکیـان لە پـێ نەکـرد، کڵاوێکیـان لە سـەر نەکـرد، خواردنێکی وایان نەخوارد، چایەش هەر هیچ، هەینێ بـۆ ئێمەمانـان کوا چایە.

قات و قڕی بوو، لەمێژ نەبوو ئۆسمانی تۆویـان بڕابووبـۆوە، نـان بۆ بێوەژنێکی وەک من لە قورگی شێر بوو، لە ناچاری، ئەو کوڕەی من هەر دەستی گۆچانی گرت، بووە بەرخەوان، ئەویـدی زوو خـاڵی بردی و کردیە کوڕی خۆی، ئەو بستە منـداڵە بە گەرمـا و بـاوبۆران بەو دەشـتەوە، کـاتێ هەراشـتر بـوو، بـووە شـوان، هـاوینێکیش بـۆ کرێکاری چووە شاری، ئەو دەیژیاندم، ئەو نەبا، لە برسا دەمردم.

دەیگۆ:

دایە

دەمگۆ:

گیانی دایە

دەیگۆ:

تۆ خەمی هیچت نەبێ، لە ناو بەردیش بێ، نان دەردەهێنم، نایەلم برسی بین.

دەمگۆ:

کورم، من هەرگیز لە خۆم خۆش نابم، منداڵیت بە رووتی و برسێتی بردە سەر.

دەیگۆ:

وا مەڵێ، تۆ کە نەچوویتە دەرکی چ نامەردێ، هێندە بەسە، ئەدی ئەگەر ئێستا ناو و ناتۆرەت لە دوا با، من چیم دەکرد.

دەستی لە ملم دەکرد و سەد ماچی لێم دەکرد.

کەریمی من گەلەک شیرن و جوان بوو، بەژن شمشاڵی، لە ناو هۆزێ پیاو لە دوورەوە دەناسرایەوە، رەشتارەیێ بوو، کیهان زۆر سوور و سپی و جوانە، خۆزیان بە رەنگی وی دەخواست، چاو گەش، برۆ رەش، تا خوا حەز بکات شیرن و لە بەر دڵان.

بە منداڵی بە زەوی نەدەکەوت، لەو باوەش بۆ ئەو باوەش، باوەشی هەموو کچانی گوندی کردووە، هەراشیش بوو، روومەتی جێی ماچی کچانی پێوە مابوو، هێشتا بە سەر پێ نەکەوتبوو بابی دەیگۆ:

ئەو کورەی من گەورە بێ، کچی گوند شەڕی لە سەر دەکەن.

هەر واش دەرچوو، کچی ئەو دەشتە بۆی شێت و سەرگەردان بوویبوون، کەچی ئەو سەری هەڵنەدەهێنا، چ کچی نەدەدی، بە چاوی خۆم بینیومە کچی ناسک و نازدار ماچی بۆ هەڵداوە، وەرینەگرتۆتەوە، ئاوڕی لێ نەداوەتەوە، گەلەک شەرمن بوو، لە راست کچان سەری هەڵنەدەبڕی، نازانم کوو...

کەریمی من تا بڵێی گران و سەنگین بوو، بە بابی خۆی دەچوو بەو مندالّیە شەیتان شەرمی لێدەکرد، تیکە نانێکی نامەردی نەچووە زاری، دەستی لە کەس پان نەکردۆتەوە، نەبووە چاوبەرەژێری کەس، گێچەڵی بە کەس نەکرد، لە بەر کەسی دانەهێنا، کوڕی من مێرخاس بوو، نیشانشکێن بوو.

حەفتەیێ بەر لەوەی ماینەشێ هەڵیگرێت، هاتە بن گوێم، وردوباریک هەمووی بۆ باسکردم، بە هەناسە هەڵکێشانەوە، گوتی:

دایە، هێ لەو رێیە، چ رێمان لە پێش نیە.

گوتم:

برۆ، خودا چەپارەتان بدات.

+ کورم داستاننووس، داستانی مامت جوان بنووسەوە، وەک هی ئەو گۆیندە و بەندبێژانە نەبێ

- نەنە، بە دڵی تۆ دەبێ.

## ٦

ئەمن مەلا سلێمانم، تۆ بڵێ مەلا داستان، بەڵام لە قورئان و فەرمووودان تەنها نوێژ و سێ چوار نزایان دەزانم، من مەلای بەند و سەربردانم، مەلای داستانم، زوو، زۆر زوو، چەند ساڵێ بەر لەوەی خۆیشی ببێتە داستان، ستی خان ئەو ناوەی لێم نابوو، ئەویش بڵێ کوو؟

دەمەو ئێوارەکی، لە بەری چیاوە بەرەو گوند دەهات، دەستی بە بڕی ماینەشێوە گرتبوو، بـاڵی گرتبوو، ئەمن وا تێگەیشتم، جڵەوگیری لە دەست دەرچووە و بۆی راناوەستێ، بە هەڵەداوان چوومە پێشی، باڵم کردەوە:

هۆش، هۆش...

کەمێ لێم رەت بوو، ترومبێل چۆن لە پڕ لە قوڕ دەچەقێ، ماینەشێ ئاوا وەستا، تێگەیشتم سەرچیخ رۆیشتووم، وەی خوایە، ستی چ ستی! لە جوانیی گەڕێ، لە سواری، سەت سواری دەهێنا، ماین چ ماین! سەت سەگلاویی دەهێنا، ئێ، بە سەر خۆم نەهێنا، یەکسەر ئەو بەندەم بۆ هات:

سواری ماینەشێ، سواری ماینەشێ

لە خودام داوایە چ جێت نەئێشێ

بێ زین و رێشمە چۆن وا دەبەزی؟

**تێکەڵاو بوونە وا بڕ و کەژی**

**یاخوا مایەشێ هەرگیز نەکەوێ**

**ئەسپێکی وەک خۆی لێ هەڵبکەوێ**

**ئەللاهو ئەکبەر لەو..........**

بەندی پساندم و نەیهێشت بە دڵی خۆم پێیدا هەڵبڵێم، گوتی:

مەلای داستانێ، وا دیارە زۆرت لە دڵە.

باڵی گرت و لە ناو تۆزێ بزر بوو، ئەوجا ئەو ناوەی زاری ویم زۆر لە دڵ خۆشهات، بۆیێ لە هەینیێوە تا هەوکە من مەلای داستانم، گەلەک داستانم گێڕاوەتەوە، ئەوە داستانی ئەسمەر و مامەر، ئەوە داستانی حەسەن و مریەم، ئەوە داستانی شێخەکەی ماڵ لە رەشوانێ... زۆر داستانیش هەیە بەند بەند بە خۆم دامناوە.

داستانی کەریم و ستی، ئی منن، بەند بەند ئی خۆمن، کەس نەیدەوێرا ناویان بهێنێ، من هۆنیومنەوە و لە گووەند و دانیشتنان دەمگوتنەوە، لە سەر هەندێش، هەڕەشەیان لێمکرد، تووشی راونان و خۆ شاردنەوە هاتم.

کەریم گەلەک برادەرم بوو، زوو دڵی خۆی بۆ من کردەوە، هێندە زاخەی هەمە لەوەوەیە، تەنها من دەزانم چەند مەرد بوو، ئەو فێری کردم نەبمە شایەری بەگ و خانەدانان...

داخی گرانم، ئێستا بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە، کەمێکی نەبێ، هەموو بەند و داستانانم لەبیرچۆتەوە.

- بیرتە بەرایی کەریم و ستیت چۆن دەستپێکرد؟

+ بەرایی نا، بەڵام برەک دوای بەرایی بەو شێوەیە بوو:

((ستی رووی خۆی لێ شووشت و

رەشی کرد چاوی کاری

هێ کچێ، چاوان مەشێ

جوانەکی زۆر نازداری

مەمکۆڵەت کارکە سێوە

روومەت گوری بوهاری

کەریم لەبۆی سەرخۆش بوو

دەستی دا جامبێزاری

هەستە ستی با برۆین

....................))

٧

دابەزی، دوو مستە ئاوی بە دەموچاوی داکرد، ئەو کانیە، تاکە کانیی ئەو دەڤەرەیە کە ئاوەکەی شیرن بێ، کانیەکانیدی تاڵن ناخورێنەوە، ئەو کانیە دواتر بە کانی ئەوین کەوتە ناو بەند و داستانەوە.

لە سەر کانی ئەوین، چۆکی داداوە، هەردوو دەستی گەیاندە سەر بەردی لێواری کانیەکە، لە دوورەوە، وێنەکە لە شێوەی کەسێ خۆی نیشاندەدا کەلە کڕنووش بردن بێت، کەزی درێژی لە شێوەی پەلکی شۆڕەبی شۆڕبوونەوە ناو کانی، لێوی گەیشتە ئاو و نەگەیشتێ، لە کەلێنی تیسکانەوە سێبەرێکی بە سەر خۆیەوە دی، سێبەری مایەنەکە نەبوو، بە سێبەری مرۆڤ دەچوو، ئاوەکەی نەخواردەوە و لە سەرخۆ قیت بۆوە، بەر لەوەی سەر سەرەو سێبەر هەڵبڕێ، ناسیەوە، بە سێبەر ناسیەوە، ئاخر چ بەژنێ لە بەژنی وی ناچێ، بەژنێک دەتگوت شمشاڵ لە سەر شێوەی وی دروستکراوە، سەری هەڵبڕی سێبەر نەما، هەر بە دانیشتنەوەوە، چاوی گێڕا کەس دیار نەبوو، بەر لەوەی هەستێتەوە سەر پێ، گازیکرد:

وەرە، بزانم بە دوای چیدا دەگەڕێی؟

دەرکەوتنی ئەو کوڕە لەو ناوە لەو ماوە کورتە ئاسایی نەبوو، ئاخر بەر لە دابەزینی لە مایەنەشێ کە هەمووی دوو خولەک نابێ، بنیادەم لەو دەوروبەرە نەبوو.

گوتی:

هیچ، تینووم بوو، تۆم دی گەڕامەوە.

گوتی:

بەڵام، لە کوێ پەیدا بووی؟ من کە گەیشتمە ئێرە، کەس لەو نزیکانە نەبوو.

– من بمەوێ بگەمە هەر شوێنێ، هێندەی تا حەفت بژمێرم دەگەمێ.

هاتە سەر زاری بڵێ: شوانۆ، ئەدی مێگەلەکەت لە کوێیە؟ گێڕایەوە و بەو پرسیارەی گۆڕیەوە:

+ دیارە باڵداری! باڵی چیت پێوەیە؟

– باڵی ئەوین.

+ دەمێکە ئەو باڵەت لێ رواوە؟

– بەینێکە.

+ چەند دەبێ؟

– لەوەتەی کچێ بەسەر ماینەشێوە دەبینم.

کچە سەری داخست، بزەیەکی شیرنی کرد و خۆی هەڵدایەوە سەر ماینەشێی بێ زین و لغاو، دەستی بە بژیەوە گرت و تاوی دا.

چیا دیدڤانە بە سەر ئەم دیدارە، یەکەم دیداری ئەو کوڕ و کچە منداڵکارە، ئەو کوڕ و کچەی بە کەریم و ستی، بوونە داستانێ، جیا لە هەموو داستانێ.

****

ستی وا لە بن دارتووی بەر ماڵان، لە سەر جۆلانەی خۆی، خۆی دەهەژێنێ، لە ئاوایی ئەو جۆلانەیە بە جۆلانەی ستی ناوی دێ، تا ئەو هەبێ، کەس بۆی نیە لێی بچێتە پێشێ، ماینەکەش لاشانێکی داوەتە قەدی دارەکە و ئارەقەی شینومۆری دەرداوە، چ سپێتیی رەنگی چ ئەو پنتۆک پنتۆکەی لەناو سپێتیەکە لە دوورەوە سوور دەچنەوە، ئێستا ئارەقە رەنگی گۆڕیون، دەنگی هەناسەشی باڵداری سەر درەختەکە هەڵدەفڕێنێ، ستیش هەر لە دەنگی وی هاتەوە سەر جۆلانە، ئاخر ئەو لە سەر کانیەکەی بن چیا، کانی ئەوین بە جێمابوو، لەوێ خۆی دابووە سێبەری کوڕە و نەیدەویست لێو لە کانیەکە بکاتەوە، حەزیدەکرد، تا رۆژ ئاوادەبێ لە بن سێبەری وی بمێنێتەوە:

هەڵەم کرد، زوو ئەو سێبەرەم لە خۆم کرد.

هێندەی لە سێبەرەکەوە هەستی بە ئاسوودەیی کرد، هێندە لەو چەند گوتە کورتانەوە نا، ئەو گوتانەی دەتگوت هەنگوینن...

ستی بیریناکەویتەوە، چۆن لە سەر کانی ئەوینەوە گەیشتۆتە سەر جۆلانە، وەک خەون بیریدەکەویتەوە، پیاویک لە ری رایگرت و بەندیکی بۆ گوت، هیندەو تەواو.

لە ئارەقە و ماندوویتی ماینەوە، دەزانی لە ری بالی گرتووە، وینەی بالگرتنی شوانەی ئەویندار، دلی بە ماین سووتا، هەیهایەکی لیکرد، ماین بە چوارپەلە ریی مالیی گرت، ماینی ستی وایە، تا ئامارەی رۆیشتنی بۆ نەکات بەجیینا هیلی و لە جیی خۆی ناجوولی ئەگەر رەوە گورگیشی بۆ بی، ئەگەر لە برسیتی و تینوویتی چاوی رەش بی، ئەوە نالیم ئەگەر سوار لە خوین بگەوزی و زاری بشکی و پیویستی بە ماین بی هەوالی بۆ مالی بەری، ماینەشی هیشتا جوانوو بوو، بابی دایە ستی، ئەویش بە هۆی خەونیکەوە، لەو خەونە:

لە ئاقاری شیخە لاسی لە نزیک بنەداری، ریک لە ناوەندی خویرسکەکەوە، زەوی کون دەبی، پیری دیتە دەری، بە ناوی پیری لاس خۆی بە خەلک دەناسینی و دەلیتە بابی ستی: من میوانی تۆم

دەیهینیتەوە مالی، لە سەر نان خواردنی، ستی دەلیتە بابی:

بابە، ئەو جوانیە ماینەم بدی.

باب دەلی:

کچم بۆ چیتە؟ کچ و سواریان گوتووە!

پیری لاس دەستی چەپ بە ردێنە درێژەکەیدا دێنێ کە لە سەر کۆشیتی، دەستی راستیشی دەخاتە سەر مشتووی خەنجەرەکەی و دەڵێ:

بۆ نایدەیتێ، لە کچی خۆت چاوە؟

خەونەکە بۆ ژنەکەی دەگێڕێتەوە، ژنە دەڵێ:

ئەوجا دەڵێی چی؟ لە فەرمانی پیر دەردەچی!

دەڵێ:

نا، چۆن دەوێرم...

ئەوجا، بابی ستی هێند ورد باسی ئەو شوێنەی دەکرد کە پیری لاسی لێ هاتە دەرێ، ستی بە بنە دارەکە پێکەوتەوە، خوێرسکەکەی دیتەوە، هەر جارێ ڕێی دەکەوتە ئەو لا، دەبوو سەرێ لە شوێنەکە بدات، وەک نزرگەی لێهاتبوو، بە پێکەنینەوە دەیگۆت:

پیری لاس، ئەگەر تۆ نەبای، ماینەشێش نەدەبوو.

جوانوو لەو خەونەوە بووە هی ستی، بە دەستی خۆی ئاوی دەدا، جۆرکی ئالیکی بە سەرەوە دەکات، ئاخوڕ و تەویلەی بۆ خاوێن دەکاتەوە، دایدەکات و دەیباتە ئاقار و رایدەتەورێنێ، زوو پشتی کرد، خۆ هێشتا هەر نۆمایە، سێ ساڵ و شتێکە، بەڵام ستی پەلەی بوو، نۆماش چەند مانگێک تەمەنی خۆی گەورەتر

نیشانده‌دا، یه‌که‌م که‌س بوو، سواری پشتی بێ، ستی و نۆما وا پێکه‌وه پێده‌گه‌ن.

وای لێهاتووه بێ یه‌کتر ناویان نه‌یه‌ت، هه‌ر هێنده نا، زۆر جار ناویشیان ده‌گۆڕنه‌وه، زۆر که‌س به ماینه‌شێ ده‌ڵێ ستی، ستیش به ماینه‌شێ گازده‌که‌ن، دایکی ستیش لێی تێکه‌ڵاو بووه، ده‌ڵێته ستی، ماینه جوانه‌که‌م.

ده‌ڵێته ماین، ستی گیان.

به‌و ده‌مه‌و ئێواره که خۆر ده‌مێکه که‌وتۆته چیا، ستی نه‌رم نه‌رم به ڕێوه، له بن دارتووه‌که‌وه بۆ ماڵێ هه‌ر به‌ردهاوێژێکه، به‌ڵام ئه‌و تا گه‌یشته‌وه زۆری ویست، پێی له دوای نه‌ده‌هات، وه‌ک بڵێی به زۆر رایکێشنه‌وه ماڵێ وا بوو، له هه‌ر چوار پێنج پێنگاڤێ ئاوڕێکی چیا، ئاوڕی کانیه‌که‌ی بنار، ئاوڕی به‌ژنی شمشاڵیی شوانه‌که‌ی ده‌دایه‌وه.

شوانه، ماڵیان له گوندی بن بنار بوو، ستی چه‌ند جارێ له ڕێوبان بینیبووی، تا ئه‌وڕۆی سه‌ر کانی، قسه‌ی ده‌گه‌ڵ نه‌کردبوو، به‌ڵام هه‌ر جارێ ده‌یدی چاوی له سه‌ر به‌ژنی هه‌ڵنه‌ده‌گرت، شوانه‌ش سه‌ری داده‌خست.

ستی ئه‌و سه‌ر داخستنه‌ی له دڵ خۆش بوو، بۆوه‌ی له تێری له به‌ژنی بڕوانێ، هێ له هه‌ندێش کاری به رووخساری کوڕه نه‌بوو،

ئـاخر بە تەمـای هـیچ نەبـوو، هەرگیـز بە خەیـاڵی دانەدەهـات، لەو نێوانە حەزێ ئەوینێ بڕسکێ کە بێوەی هەست پێبکات رسکابوو.

لە بەر خۆیەوە دەڵێ:

سـێبەری سـەر کـانی ئەوەی گـۆڕی، بـاڵی ئەوینـی زاری شـوانە گۆڕی، لە گڕە بکەومە ئەوینەوە، نا، نابێ، باشە بۆ؟ تێناگەم.

دایکی لە سەر دەرگاوە هەستیپێکرد:

مائینە جوانەکەم، چیـت لـێ قەمـاوە، کـێ گێچەڵـی پێکردوویـت؟ کوێت دێشێ؟ رەنگ بە رووتەوە نەماوە.

سـتی خـۆی خڕکـردەوە و بە زۆر پێکەنینێکـی بە رووی دایکـی دادا:

دایـێ، نە نەخۆشـم، نە هـیچ تەرەسـێکیش گێچەڵـی پێکـردووم، تەنها کەمێ ماندووم.

دایک:

خوابکەم وابێ، بەڵام پێکەنینەکەت هی خۆت نەبوو.

ستی بەوە پێکنینی هات و پێکەنی.

دایک:

ئا کچەکەم، من پێکەنینی ئەوهام دەوێ.

ستی ئەو شەوە خەوی لێنەدەکەوت و هەر تەنیشتانی دەگۆڕی و بە زاری دڵ قسەی بۆ خۆی دەکرد:

باشە ئەو شوانە شەرمنە، جلک شڕە، ئەو بوێرییەی لە کوێ هێنا وا بەو شێوە، ڕاست و ڕەوان وا بە من بڵێ؟ تۆ بڵێی نەیزانیبێ لە سەر قسەی لەو شێوە، داری من بە پشتی سێ چوار کوڕ کەوتووە، لەوەوە کیهان کوڕی زۆر ئازایە، زاری خۆی بەست و...

تۆ بڵێی هەستی کردبێ، من بە بەژنی وی سەرسامم؟ نا، باوەڕناکەم، بڵێم چی...

ئەدی دەبێت نەیبیستبێتەوە، وەک من لەو چەند ڕۆژە بیستمەوە، ئاغا بە ئاواییدا بڵاویکردۆتەوە:

لە ئێستاوە ستی هی خۆمانە، کەس بە لایدا نەچێ.

هەر کێ لێی نزیکبکەوێتەوە، پێی دەشکێنم.

تۆ بڵێی بیستبێتیەوە بیەوێ بڵێ:

ئەوە من لێی نزیکبوومەوە، بزانم چ دەکەی؟

ئەگەر وابێ بە ڕاستی قارەمانە، بەڵام شوانێکی وا چۆن دەتوانێ ببێتە قارەمانێکی وا، بەرەنگاری کەسێک ببێتەوە کە بە ئامـاژەی سەری پەنجە، دە پیاو لە خوێن دەگەوزێ، تێناگەم...

دەترسم کەسێکی گێلۆکە بێ، ئاگای لە دنیا نەبێ، نە من بەو شێوەیە بناسێ، نە بزانێ شتێ هەیە ناوی ئاغا بێ، ڕێی تێدەچێ؟! نا، قسەکانی قسەی کەسی گێلۆکە نین، گێل چووزانی (باڵی ئەوین) چیە، ڕووخساریشی بە گێلان نەدەچوو...

وای، خۆ من تازە ڕووخساریم بیردەکەوێتەوە، ڕەشتارەیەکی چەند شیرن، چاو و برۆ ڕەش...

خۆ من لە خەونەکەش ڕووخساریم نەدی، ئەرێ تۆ بڵێی ئەویش خەونێکی وای بە منەوە نەدی بێت!

ستی خەونەکی خۆی بیرکەوتەوە، ئەو خەونەی لە بیرنەدەچۆوە، ئەو کوڕە بەژن شمشاڵیە، هاتە سەری، بە دەستێکی ران، بە دەستێکی مەمکی دەگوشی...

یەکەم جاری بوو خەونی وا ببینێ، دواتریش خەونی لەو شێوەی بە دوو پیاوی ئاواییەوە دی، تا ماوەیەک کە دەیبینین شەرمی لێدەکردن، وای دەزانی بە خەونەکەی دەزانن.

ستی لەبەر خۆوە دەڵێ:

بڵێی، ئەویش خەونێکی وای بە منەوە دیبێ، بۆیێ...

ئەوە من باسی چی دەکەم؟!

ئەو شەوە ستی لە پشت کانی ئەوین ڕێی کەوتە ناو ڕەزوباخێ، پێشتر ڕێی پێنەکەوتبێ، وەرزی ڕەزبەر بوو، هەرچی میوەی دنیا

هەیە، هی بەهەشت هەیە وا بەو رەزەوە، لە سەر پشتی ماینەوە، میوە میوە، میوەی دەرنی و دەیخستە زاری، تێر نەدەبوو، لە هیکڕا بە ماینەوە کەوتە بیرێکی قووڵەوە و زرمەیێ هات.

خەونەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە، دایک گوتی:

ماینە جوانەکەم، هاییداری خۆت بە، بزانە بە چ ڕێیەکدا دەڕۆی.

# ٨

ستی سەری چەند ڕۆژە لە گژ شەنوکەوکردنی خەونەکەیەتی، دەستی هیچ ناگرێ، لە ماڵێوە بۆ سەر جۆلانێ، لە جۆلانێوە بۆ ماڵێ، ماینەشێش کووتکووتە ئاسا بە دوایەوە، ماین پیشەی خۆیەتی، تا فەرمانی مانەوەی پێنەکرێ، لە دوای نابێتەوە، ناوە ناوە دێتە پێشی، کەمێ خۆ دەچەمێنێ، واتە:

سواربە و با بڕۆین.

ماین لەوەتەی پشتی گرتووە، ڕۆژێ نا ڕۆژێ سەردانی بناری کردووە، سەیری پێدێ ستی سوار نابێ، گوندیش هەستی پێکردبوو، هەموو لە خەمی ستی بوون، کەس نەبوو ستی خۆشنەوێ، ورد و درشت، نێرینە و مێیینە، تەنها ئاغاژن نەبێ.

دایکی ستی پێیگۆتبوون:

کچەکەم تووشی سەرسووڕە بووە، لە خۆ رانابینێ، سوار بێ.

ئاغاژن لە بن لێوانەوە گوتبووی:

قیت نەبێتەوە.

ستی ئاگای لە ماین و بنار و گوند نەماوە، چەند ڕۆژە، وا بووە حەفتە و مانگ، بەهار تەواو، هاوین چوو، پایز داهات، بیر

دەکاتەوە خەونەکەی بۆ خەونزانێ بگێڕێتەوە یان نا، کێ خەونزانی باشە؟ یووسفێ لە کوێ ببینێتەوە؟ داخوا نەنەی خەونزان لێکدانەوەی خەونانی لەبیرنەچووبێتەوە؟

زوو، سەید و شێخیش بۆ خەونان دەهاتنە کن نەنەی خەونزان، بەڵام هەوکە کە لە سەر لێواری گۆڕە، ئەوڕۆ نا سبەی کێل دەبێتەوە، هەندەک دەڵێن:

خەونان بەرەواژ لێکدەداتەوە.

هەندەک دەڵێن:

نا، گوێی زۆر گران بووە، بە بەرەواژی لە خەون گێڕەوە تێدەگات، بۆیێ لێکدانەوەکەش لنگاوقووچ دەبێتەوە.

ستی، بڕیاریدا تا بچێت و بە دەنگی زۆر بەرز خەونەکەی بۆ بگێڕێتەوە و چەند بارەی بکاتەوە، تا بە باشی تێبگات و وەک خۆی لێکیبداتەوە، چوو، لە گێڕانەوە دەنگی وەها هەڵبڕی، لە کۆڵانێ گوێت لێدەبوو، هەر وشەیەکی چەند پاتە دەکردەوە، پیرێژن گۆتی:

ئێ، تێگەیشتم، تێگەیشتم، خۆ کەڕ نیم.

کەمێ داما، دەستی لەزۆکی خستە سەر رانی ستی:

کچم، چ نیە، دڵت چی خواست، بیدێ.

ستی، یەکسەر گۆتەی پیرێژنی چووە دڵی، لە بن باری گرانی خەونەکە هاتە دەرێ و هەستیکرد لەشی هێندە سووک بووە، باڵ لێکبدات دەفڕێ، ماینەشێ لە سەر دەرگا راوەستا بوو، گۆتی:

شێ، با بڕۆین.

ستی بە شێ گازی ماینەکەی دەکرد، شێ کەمێ خۆی نەوی کرد، خۆی هەڵدایە سەر پشتی و بازێ، وێنەی پەلیک لە ئاوایی دەرچوو، لە راستی ئاقاری شوانە هێوری کردەوە، بە هەردوو بەری رێ تا چاو بڕەکات چاو دەگێڕێ، دیار نیە، شوان و مێگەلەکەی لە چ جێ دیار نین، ستی مێگەلەکەی ئەویشی دەناسیەوە، بە چەند سەر بزنێ دەیناسینەوە، ئەو بزنانە پتر دابوویانە سەر مامز، کەمتر لە بزنیان دەکردەوە، ستی دەنگی زەنگوڵەی ملی نێریەکەشی دەناسیەوە، لە زەنگوڵەی چ مێگەلێکیدی نەدەچوو.

گەڕا، بە بناردا هەڵگەڕا، نیە، شوان و مێگەل نیە، رێی کانی ئەوینی گرت:

دەبێ، چکی نەکردبێ!

ستی تەنها چەند جارێ، ئەویش لەو بەهارەی چووی کانیەکەی دیتبوو، نەیدەزانی، نەیپرسیبوو، داخوا کانی بەهارانەیە، چوار وەرزەیە؟ نزیک بۆوە، لە خوار کانی دوو سێ قان چێنکەی دی، زانی کانی چکی نەکردووە، گەیشت، هەر ئەوەتا لە بەری دەڕۆیی.

لە شێوەی جاری پێشوو، جاری بەهاری پێشوو، بەو پایزە، دانەویەوە، زاری لە کانی نەکردەوە، با باویلکە دەهێنێ و بە سەر و پرچیدا وەردەکات، ستی زۆر حەزی لە سەمای باویلکەی دەست بایە، هەر لەبەر هەندێ پایزی خۆش دەویست، ئێستا لەبن ئەو سەما ناسکەوە چاوەڕێی سێبەری شوانەکەیە، نەهات، چۆکی شل بوو، دەستی شکا، سێبەر نەهات، مایەشێ حیلاندی، حیلەی گازکردن بوو، ماین چەند جۆرێ حیلەی هەبوو، ستی لێکی دەکردنەوە، دەیناسینەوە، ئەوە حیلەی گازکردنی ستی، ئەوە حیلەی ئاگادارکردنەوە لە شتێک، حیلەی تێنوویتی و برسێتی، حیلەی...

ستی بە دڵشکاوی هەستاوە، دەستی لە ملی ماین کرد و بە پەنجە ناسکەکانی کەوتە شانەکردنی یالی، ماین ئەوەی زۆر خۆش لێدەهات، خۆی کڕ دەکرد، ستی دەڵێ:

شێی من، بە من بڵێ دەبێ شوانەکەم لە کوێ بێ؟

ماین وەک بڵێی لە پرسیارەکەی تێگەیشتبێ، سەری بادا، هەر کێ ئەو سەربادانەی دیتبا، تێدەگەیشت سەر بادانی:

منیش نازانم.

مایەشێ تێگەیی کە ستی شنگ و تینی لە بەر نەماوە، تەواو بۆی چەمیەوە، هەر دوو پاشووی نووشتاندەوە، چۆکی هەر بستێ

مـابوو بگـاتە زەوی، ئەو جـولانەوەیەش تـایبەت بـوو بە ماینەشـێ، ستی سوار بوو، هێور هێور بە بناردا هاتە خوارێ.

شمشاڵێکی خەمگین هـاتە گـوێی، سـەری ماینەشـێی بەرەو لای شمشاڵ وەرسووڕاند:

تۆ بڵێی ئەو نەبێ؟

بە شمشـاڵ نایناسـێتەوە، ئـاخر وا رێـک نەکەوتـووە، گـوێی لە شمشـــاڵی ئەو بەژن شمشـــاڵیە بـــووبێ، هەر جـــارێ بە لایـــدا تێپەڕبـــووبێ، شمشـــاڵەکەی لە بەر پشـــتێنی بـــووە، چـــوو چـــوو، شمشـــاڵژەنی لـــێ وەدیـــار کەوت، لە ســـەر بەردێ راوەســـتابوو، هەناسـەیەکی سـاردی هەڵکێشـا، هەو نەبـوو، بەژنـی شـوانە بەژن شمشـاڵیەکەی ئەو نەبـوو، ویسـتی سـۆراخی شـوانەکەی خـۆی لـێ بپرسێ، نەیپرسی و رووی شـێی وەرسـووڕاند، تـا گەیشـتە ئـاوایی، چاوی لەو دەشت و دەرە گێڕا، لە بەرخۆوە دەڵێ:

ئەو خەونە، چی لە من کرد، ئەو کوڕەم چۆن لە دەست خۆم دا، هەر هیچی بە سەر نەهاتبێ.

ئەو شەوە، ستی لە خەوێش قسەی کردبوو، کاتێ وەئاگا هـات، دایکی لە پشت سەری دانیشتبوو، دەستی بە پرچی خـاو و نەرمـی داهێنا کە دەتگوت پەشمینە، پرسی:

+ کچم بە دایکی خۆت بڵێ، بە دوای کێدا دەگەڕێی؟

کچ:

گەڕانی چی!

دایک:

لە خەوێ دەتگۆ: دەیبینمەوە، هەر دەیبینمەوە

کچ:

ئەها، بیرمکەوتەوە، لە خەونێ شمشاڵەکم بزرکردبوو، کون بە کون لە دوای دەگەڕام.

دایک:

ئەیەڕۆ، شمشاڵ! ماینەکەم، تۆ خەونی سەیر و سەمەرە دەبینی.

چێشتانە، گازی ماینەشێی کرد و بە دوای شمشاڵە بزربووەکەیدا چوو:

هەر دەبێ بیبینمەوە...

نەگەیشتبووە بناری چیا، دەنگی زەنگوڵە هات، ناسیەوە، هەوە، بەرەو زەنگوڵە چوو، لە گەوەکە سەرکەوت، مێگەل دەرکەوت، هەو بوو، لە پەڕگەی مێگەلەوە دوو لەو بزنانەی دیتەوە کە لە مامز دەچوون، شوان دیار نیە، لە دڵێ خۆ دەڵێ:

هەبێ نەبێ، لە دوورەوە، منی دیتووە و بەرەو کانیەکە ڕۆیشتووە، با زوو بگەمێ.

ویستی ماینەشێ تاودا، لە بن دەوەنێکەوە شوانێک قیتبۆوە، هەو نەبوو، شوان پرسی:

ها، ستی خان، چ دەکەی لەو ناوە؟

وا دیارە ئەویش دەیناسێ، ما کێ هەیە ستی نەناسێ!

ستی:

بە تۆ چی، لۆ دەپرسی؟

شوان:

هیچ، گوتم نەوەک شتێکی بزرکردبێ.

ستی:

هیچ، هیچم بزر نەکردووە، بە من بڵێ تۆ دەڵێی تازە شوانی، من تۆم لەو ناوە نەدیتووە.

شوان:

ئا، چەند ڕۆژێکە.

ستی:

شوانەکەی پێشوو، چی لێهات، شەرتی هەڵات؟

شوان:

نا، ناوی سەربازیی هات، چووە شار.

ستی تەزوویەکی وا بە لەشی داهات، ماینەشێ هەستی پێکرد و راچڵەکی.

بەڵام هەوڵیدا بە سەر خۆی نەهێنێ و تازە شوان هەستی پێنەکات:

ئەدی تۆ کەنگی ناوت دێ؟

تازە شوان:

من گچکەم، هێشتاساڵێکم ماوە.

ستی:

خۆ ئەو لە تۆش گچکەتر بوو

تازە شوان:

نا، ئاوزەی من بوو، بەڵام گەورە نووسرابوو.

ستی، چۆن گەیشتەوە ئاوایی، چۆن لە دەرگای ماڵی پیرێژنی خەونزان چووە ژوورێ، مەگەر تەنها ماینەشێ بزانێ، هەر دەبێ ئەو بێتە زمان و ستیی ئەوە رێیەمان بۆ بگێڕێتەوە.

ستی فرمێسکی دەسڕێتەوە و دەڵێتە خەونزان:

نەنێ، لە سەر قسەی تۆ بە رێی دڵدا چووم، نەگەیشتمێ...

پیرێژنی خەونزان:

کچم، پەلەی ناوێ، دەگەیتێ، لە نەنکی خۆتی وەرگرە دەگەیتێ.

ستی ئاهێکی هاتەوە بەر و چۆوە بن دارتووەکە و تێر جۆلانەی کرد و گەڕاوە ماڵێ.

ئەو چەند مانگە بە هۆی خەونەکەیەوە لە گوند دابڕابوو، نەیزانیبوو، چی روویداوە لە دنیایێ، ئێستا بە هۆی ناوی سەربازی و بزربوونی شوانە گچکەلانەکەی خۆی، وا لەگژە بە دنیا دەکەوێتەوە و گوێ لە باسوخواس دەگرێ، دەبیستێ، لە باب و دایک و گوند دەبیستێ:

سەربازی بە زۆرە، هیچ کوڕێ بۆی نیە نەچێ، مەگەر... ئەوانەی دەچنە سەربازییش، ئەگەر سەریان تیا نەچێ، بە ساڵ، یالا سەردەدەنەوە.

جەنگێک بەرپابووە، سەرانسەری دنیای گرتۆتەوە، ناوی ئەو جەنگە بە جەنگی دووەمی جیهانی رۆیشتووە.

لێرە و لە زۆر جێش گرانی داهاتووە و نان بە ئاسانی دەستناکەوێ، وا بڕوات گرانیی گەورە دووبارە دەبێتەوە.

ئێستگەیەکیش پەیدا بووە، دەڵێن لە بەغدایە، بە کوردی قسە دەکات و گۆرانی دەڵێ.

ستیش جاروبار لە دوورەوە لەماڵی ئاغا گوێی لێ دەبێ، ئاخر تەنها ئەوان رادیۆیان هەیە، ئەویش سوێندی خواردووە، پێی بە ماڵی وان نەکەوێ.

ستی چاوی لە رێیە، کوڕەی بەژن شمشاڵی باڵی ئەوین بگرێ و بگاتەوە سەر کانی، بۆیە سەر لە کانی ئەوین نابڕێ، لە جاران پتر رێی کانی ئەوین دەگرێ.

## ٩

حەفتەی دوو جار سێ جار بە یادی سێبەری بەژن شمشاڵی سەر بە سەر کانیدا دادەگرێ، باڵی ئەوین هەڵیدەگرێ و دەیباتە شار، سەر قەڵات و ناو قەیسەری پێدەکات و لە دوورەوە چاو لە سەری منارە دەبڕێ و لە دوای شوانەکەی خۆی دەگەڕێ، ستی تا ئێستا یەک جار شاری دیوە، بەڵام ئەو شوێنانەی شاری وەها لە چاو نەخشاوە، رەشنابنەوە، وا دێتە خەیاڵی بەر لەوەی بەرگی سەربازی لە بەر بکات و رایپێچن بەو شوێنانەدا گەڕاوە.

لە شارەوە هەر بە باڵی ئەوین هەڵدەفڕێ، لە ئاسمانی شار دەسووڕێتەوە و نازانی چ رێیەک بگرێ، کەس نیە لێی بپرسێ:

ئەرێ سەربازێکی بەژن شمشاڵیی رەشتارەتان نەدیوە، نەتاندی، بە کام لادا رۆیی؟!

یەکەم بارانی پایز کەوت، بۆنی خاک مەستت دەکات، ماینەشێ وێدەچێ زۆر حەز بەو بۆنە بکات، ئەوەتا لە سەر خۆڵێ بۆن بە جێی دڵۆپە بارانەوە دەکات، بە شێوەیێ سەر بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێ، وەک بڵێی سوپاسی هەور بکات کە ئەو دڵۆپە درشتانەی بۆ باراندووە، ستیش چ پایزێ وەک ئەو پایزە ئاوێتەی خاک و باران نەبووە، لە سەر پشتی ماینەوە ئامێزی بۆ سرووشت کردۆتەوە، پڕ بە سینەی هەوا هەڵدەمژێ، هەناسە رادەگرێ، دڵی

نـایێ بیـداتەوە، سـتی بە خەیـاڵ وا کـوڕە شـوانی لە پشـت خـۆی سـوارکردووە، دەسـتی لە قەدی ئاڵانـدووە، هەسـتدەکات تونـد دەیگوشێ...

سەرپەرەیە، ستی گەیشتەوە سەر کانی، لێرە و لەوێ چەند پەلە هەورێکی خۆڵەکەوەیی تادێ لێکدی نزیکدەبنەوە، وێدەچێ نیـازی بارینیان لە چاو بێ، نەرمە بایێ هەڵیکـردووە لە بـای وادە دەچـێ، بنار جێ جێ سێبەرە، ئەویدی تاوە، بە جیـاوازی رەنـگەوە، کەمـێ لە ماینەشێ دەچێ، ئەوە نیە سپی سپی، جێ جـێ مـاکی سـووری تێدا، ستیش حەزی لە کراسێ دەکرد لە رەنگی مـاینەکەی، جارێـک دایکی پرسی بووی:

کچم، حەزت لە چ رەنگە؟

گوتبووی:

رەنگی ماینەشێ.

سـتی لە سـەر کـانی ئەویـن کە تەڕاتـی تێـدا مـابوو، چکـی نەکردبـوو، کەوتبـووە خەیـاڵی رەنگـی بنـار و مـاین و کـراس، لە وانیشەوە بۆ بەژنی کوڕە شوان، بیریـدەکردەوە، نەدەهـاتەوە بیـری ئەو رۆژە رەنگی کورتەک و شەرواڵەکەی چۆن بووە، بەڵام دەیزانـی زۆر کـۆن و شـڕ بـوون، پێڵاوەکەشـی پینـەی پێـوە بـوو، ئـاهێکی هەڵکێشا:

بیبینمەوە، پارەی دەستە جلکێکی دەدەمێ.

مایەشێ حیلاندی، حیلەی (هەستە بڕۆین) نەبوو، حیلەی ئاگادارکردنەوە، هی دەرکەوتنی شتێک بوو، هەستاوە، لە سەرەوە، بە لای دوندی ئاشی باوە، لە بن بەردێکەوە:

لەمێژە لێرەی؟

ئەو دەنگە نائاشنا نیە، کێیە کێیە؟ بیرینەکەوتەوە، بە دەنگێکی حێل:

کێی کوڕۆ؟ خۆ دەرخە، بە تۆ چی!

لە تەنیشت بەردەوە بەژنێک دەرکەوت، چ بەژن! باوەڕی بە چاوی نەکرد، خەونە، خەیاڵە، چاوی رێشکە و پێشکە دەکات! زاری بەسترا.

کیژێ، ئەگەر مایەکەت قسە دەهێنێ و دەبات، زاری ببەستە.

ستی، لە جێی خۆی دەڵێی دارە شین بووە، کەریم نەرم نەرم هات، گەیشتە بەردەمی، ستی دەستی لێککردەوە و پێدەچوو بیەوێ ئامێزی پێدابکات، زوو هاتەوە سەرەخۆ:

ها، کاکی شوان دەبینم، گۆچانت بە چەک گۆڕیوەتەوە!

کاکی شوان، تفەنگەکەی لە شان هێنایە خوارێ و گوتی:

هەر ئەو رێگەیەم لە پێش بوو.

ستی هاتە سەر زاری بڵێ:

ئەدی تۆ نەبوویتە سەرباز؟

گێڕایەوە، وا خۆی نیشاندا کە هچی لەگەڵ نیە و هیچی لە بارەوە نازانێ:

باشە هەرکەسە و بە خۆی دەزانێ چ دەکات.

بۆ لای ماینەکەی چوو، ویستی سوار بێت.

- بۆ کوێ دەچی؟

- بۆ ماڵێ، بە تۆ چی!

+ هیچ، بە ماینەکەت بڵێ لە کن کەس نەڵێ، لەو بنارە تفەنگچیەکم دیتووە، با کێشەم بۆ چێ نەبێ.

ستی کەمێ داما، ئاوڕی لێدایەوە:

+ کێشەی چی، تۆ چی؟

- من ئەشقیام.

+ ئەشقیا!

ئەو وشەی بیستبوو، ئەو کەسانەی دەکەوتنە چیا و دەشت و دەر و شەڕی حوکمەتیان دەکرد، بە ئەشقیا ناویان رۆیشتبوو، بەرەو لای گەڕاوە:

+ بە راست ئەشقیای؟

- ئەدی خۆ بۆ راوە مامز و کەو بە چیا نەکەوتم.

ستی بە ئاماژە ماینەکەی تێگەیاند بچێتە سەر بەرزاییەکە و لە بە دیارکەوتنی هەر شتێ ئاگاداری بکاتەوە، ماین چوو.

ستی لە سەر بەردێ دانیشت، کەریمیش چاوی گێڕا، لە بەرانبەری، لە سەر بەردێ، تاوێ بێدەنگ تەماشای ناو چاوی یەکتریان کرد، کەریم چاوی داخست، ستی لە بن لێوانەوە، هەر ئەوەتا خۆی بیستی:

وا دیارە، ئەو کوڕە لە من شەرمنترە.

بێدەنگی درێژەی کێشا، ستی شکاندی:

+ تۆ ناچیەوە ئاوایی، هەر لەو شاخە دەمێنیەوە؟

- تا ماوەیەک ناچارم وا بکەم.

+ ئەدی خواردن؟ وا زستانیش داهات!

لەو ساتە، چەند دڵۆپە بارانێ کەوتنە سەر رووخساری، کەریم گوتی:

ستی، تۆ برۆ، با تەڕ نەبی، خەمی منت نەبێ، دوندی ئاشیبام هەبێ، کێشەم نابێ، کونە ئەشکەفت زۆرە، نیوە ماڵێکم لێرەیە، نوێنم هەیە، بایی دوو سێ حەفتە خوادنم هەیە، لێم نابڕێ، کەسێ

هەیە بۆم دەهێنی، تۆ بڕۆ، بەڵام لای کەس نەڵێی ئەشقیاین وا بەو چیایەوە.

ستی بزەیەکی شیرنی کرد:

+ من زوو زوو خواردنت بۆ دەهێنم، هەر لەو ناوەی وا نا؟

- لێرەم، بەڵام بەر لەوەی تۆ خواردنم بۆ بهێنی، حەزدەکەم دیاریەکم لێ وەرگری، لێرەش نا، لە ماڵێ بیکەوە.

ستی داما، داما، لێوی تەتەڵەی دەکرد و قسەی بۆ نەدەهات، کەریم لە بەر باخەڵی پرێسکەیەکی گچکۆکەی خڕی دەرهێنا، گچکە هەر هێندەی مەمکی ستی، هات هات، لە سەر کۆشی ستی دانا:

- خوێندەواریت نیە، وا نیە؟

+ کەم، هەر دەزانم ناوی خۆم بنووسم.

- تەنها ناوی خۆت؟! لە کوێ فێربووی؟

+ .زوو، کوڕەک هەندەک پیتی فێرکردم.

+ باشە، منیش کەم، تەنها ناوی خۆم و تۆ دەزانم بخوێنمەوە، دەی هەستە بڕۆ، تا بارانەکەی خۆش نەکردووە.

ستی پرێسکەکەی لە سەر کۆشی هەڵگرت و خستیە باخەڵی، سواری ماینەشێ بوو، ویستی هەی لێبکات، ئاوڕیدایەوە و گوتی:

+ باشە ئەدی تۆ نەچوویتە سەربازی؟

- چووم و نەچووم.

+ چۆن؟ بە کورتی بۆم بگێڕەوە تا بڕۆم.

کەریم بەخێرایی ئەوەی گێڕایەوە، کە لە شاری مووسڵ خۆی دزیوەتەوە، شەوێک بە دزیەوە بێ ئەوەی کەس بیبینێ و هەست پێبکات، دوو حەسحەسی چەککردووە و هەڵاتووە، لە ڕێ چەکێکیانی بە پارەیەکی باش فرۆشتووە، ئەویتریش وا بە شانیەوە، چەند شەو و ڕۆژی پێچووە تا گەیشتۆتەوە ئێرە، حوکمەت بەوە نازانێ، بەڵام لە ترسی زمان لێدان، ناوێرێ خۆ پێشانی خەڵک بدات، ماوەیەک بەو کێوە دەمێنێتەوە، دواتر خۆی ئاشکرا دەکات و دەڵێ، خۆم کڕیوەتەوە و لە سەربازی بەخشراوم، ئا شتێکی لەو بابەتە.

کەریم دوایوەی سەربردەی خۆی بۆ ستی گێڕایەوە، بە شەرمەوە گوتی:

چاوی تۆ نەبا، نەمدەتوانی ئەو سەرکێشیە بکەم، ئەشقیا ببم.

ستی هێندەی نەما بوو، لە سەر ماینەوە خۆ هەڵداتە ناو ئامێزی، خۆی گرت و گوتی:

+ کوڕە ئەشقیاکە، سبەی دوای نیوەڕۆ لێرەم.

- سەبەی رەنگە هەور و بارانێکی وا بێ، رێ بە رێبوار نەدا، کەینێ خۆشی کردەوە، هەینێ سەر بدەوە.

+ بە چ دەزانی، خۆ لە کن خواوە نەهاتی؟

- نا، بەڵام...

+ دێم

- چاوەڕێتم، تۆ بە من بڵێ، چۆن دەوێری بێ جل و زین سوار بی؟

+ وا راهاتووم

- زینی هەیە؟

+ زینێکی نرت و نوێی هەیە، نەچۆتە سەر چ پشتێ.

- خودا چەپارەت بدا، سوارەی بێ هاوتا.

بزەیەکی لە شێوەی پشکوتنی خونچە بۆ کرد و بە بن پڕووشەی بارانێ کە بە بای وەشتەوە دێتە خوارێ،ماینی تاودا، دەستێک بە بژی ماینەوە، دەستێکیش لە سەر پرێسکەی باخەڵی و توند توند بە سینگیەوە نووساندووە.

## ١٠

لە ڕێیێ دایکردە ڕێژنە بارانێ، ستی ئاوی لێ دەچۆڕایەوە، ماین وەک بلێی هەستیکردبێ پشتی لووس و خلیسک بووە، ترسی بەربوونەوەی ستی هەبێ، بۆیێ نەرمە غاری دەدا، چەندی ستی پانیەی لە بن زگی دەدا، بە قسەی نەدەکرد، لەوە پتر پێی هەڵنەدەهێنا، ستی دەیویست زوو بگاتەوە ماڵێ، تا پرێسکەی کوڕە ئەشقیاکە بکاتەوە.

- کچم، ئەوە تۆ لە خۆت بەڵای، بە من ناڵێی بەو بارانە لە کوێ بووی؟

+ لە کوێم، لە بنار پتر بۆ کوێ دەچم!

- دەزانم، بەڵام بۆ بەو بارانە، وەرە خۆت بگۆڕە، تا بابت نەهاتۆتەوە و وای نەبینیوی.

بەر لەوەی خۆی بگۆڕێ، ئالیکی دایە ماینەشێ، بە دزی دایکیەوە، تا گرێی پرێسکەی کردەوە، دڵی دەتگوت ئەو دڵۆپە بارانانەن کە لە مشەمای پەنجەرەکەیان دەدا:

دەبێ دیاری چی بێ؟!

دەسرۆکەیەکی عەرد سپی، ڕێک لە ڕەنگی ماینەشێ، لە چەند جێش گوڵی گچکەی سوور لە شێوەی خاڵە سوورەکانی ماینەشێ،

له لێوارێکی دەسرۆکەش بە ڕەنگی کەسک دوو پیت چنرا بوون، زۆری ویست تا خوێندنیەوە: س. ک

ئەگەر بارە زێڕێکی بۆ هاتبا، هێندەی ئەو دەسرۆکە پێی دڵخۆش نەدەبوو، بۆیە بەزۆر خۆی گرت، دەنا هاواری دەکرد و ئاوایی تێدەگەیاند، دەنگی پێی دایکی هات، بە پرتاو دەسرۆکەی سێ جار نووشتاندەوە و لە باری درێژی، خستیە نێوان مەمکیەوە.

ئەو ئێوارەیە شەوی بە گوریس کێش کرد، حەزیدەکرد لە چاوترووکانێ شەو دابێت، تا بکەوێتە خەیاڵی قووڵەوە، لەوێشەوە زوو ڕۆژ ببێتەوە و بگاتەوە سەرکانی و بن دوندی ئاشیبا.

لە سەر پشت راکشاوە و هەردوو دەستی لە سەر سینەی، لە سەر مەمک و دەسرۆکە، حەزیدەکرد تا دنیا دنیایە، دەسرۆکە جێی هەر ئەوێ بێ:

وا چاکە، لە بنەوە بە کراسەکەمیەوە بدوورم، نا...

بیریکەوتەوە، ئەو ساڵەی چووە شار، ژنێک لە ماڵی پلکی بوو، لەکاتی خۆڕووتکردنەوە دیتی، پارچە پەڕۆیەکی لە شێوەی گواندان، ئەوەی لە گوانی بزنی دەکەن، لە مەمکی خۆی کردووە، مەمکی خڕ و گچکە کردۆتەوە، مەمکدانیان دەگۆتێ، ئەرێ لە ئاوایی ئێمە چ ژنێک هەیە ئەوەی لە مەمک بێ؟ نازانم، دوور نیە...

ئا منیش لەو دەسرۆکەیە مەمکدان چێدەکەم، بۆوەی هەمیشە بە دڵمەوە بێ، نا، نابێ، دەستی لێنادەم، با وەک خۆی بمێنێتەوە.

- کچم من وا خەوتم؟ لەبیرنەکەی چراکە بکوژێنیەوە.

+ بخەوە، خەمت نەبێ.

ئێستا بیر لەوە دەکاتەوە، چ دیاریەک بۆ کورە ئەشقیا ببات، سەر دەهێنێ دەبات، شتێکی نیە بە دڵـی خۆی، شـتێ لە شـێوەی دەسرۆکەکەی وی، شتێ دڵی خۆش بکات، شاگەشـکەی بکـات، بـۆ هەتایە لە بیری نەکات و بیپارێزێ، نیە، ئاخر چ لە نەخش و نیگار نازانێ، لە ئـاواییش، ژنە تەونچیەکە، نـا، ئەو هێنـدە دەسـترەنگین نیە، لە نەخشی ورد، ورد نیە، شاری بیرکەوتەوە.

وا بە نـاو قەیسـەریدا دەگەڕێ، لە کـۆڵانی کووتاڵفرۆشـاندا پێـدا هات، چۆوە ناو زێڕنگران، سووڕایەوە، ئێستا وا لە کۆڵانی قەنەفرە، چاو دەگێڕێ، هیچی نەدیتەوە شایەنی کورە ئەشقیاکەی بن دونـدی ئاشیبا بێ، نە پژدێنێک نە زنجیرێ، نە شووشە گوڵاوێ، نە...

گەیشتەوە مـاڵی پلکـی، چـاوی وا بە سـەر نەخشـی سـەر بەرگە بالیف و پەردەی پەنجەرە، چەند ناسک، چنراون، نەخشـاون، کـچە پلک دەیگۆ:

لە سەر قەڵاتێ نەخشکارێ هەیە ناوی مرۆڤ لە شێوەی گـوڵ لە سەر بەرگە بالیف دەنەخشێنێ، هەیە لە شێوەی...

وەک بڵێی لەوێ بێت و قسە لەگەڵ کچە پلکی بکات:

ئا، من لەوەم دەوێ.

دایکی وەئاگا هات:

چیە، کچم، گازی منت کرد؟

نەیزانی چ بڵێ:

نا، دایە، پشیلە بوو، ختەم لێکرد.

دایک بە چاوی پڕ خەوەوە:

دەریکە، شتێک نەڕژێنێ.

ستی هەر وا لە شارە، گەیشتە ئەوەی دیاریەکەی ویش دەبێت دەسرۆکەیەکی نەخشدار بێت، کچە بۆی بباتە لای نەخشکارەکە و بۆی بنەخشێنێ، بەڵام نەخشەکە چی بێ؟ وا لە دوای دەگەڕێ، نازانێ کامیان هەڵبژێرێ، سەری تێداماییە:

ناوی خۆ و ئەو لە شێوەی گوڵ، نا لە شێوەی سەری مایینەشێ.

نا، ناو باش نیە، دڵی خۆمی بۆ دەنەخشێنم، بەڵام چۆن بزانێ ئەوە دڵی منە؟ خۆ نەیدیوە!

دیتمەوە، پارچە زێڕێک دەدەمە نەخشکارەکە و پێیدەڵێم:

جوان جوان تەماشای چاوم بکە، دوو چاوم دەوێ کتومت چاوی خۆم بن، بە ڕەنگ و شێوەی خۆی بنەخشێنە.

من دەبێ چاوی خۆمی بۆ بنێرم، لە دوورەوە دەیناسێتەوە، ئەو چاوانەی لە بازێڕی مووسڵەوە هێناویەوە دوندی ئاشیبا.

دیتمەوە، دیاریەکەم دیتەوە، بەڵام چۆن بگەمەوە شار، کێ دەمبات؟!

درەنگ خەوی لێکەوت و زوو هەستا، سەری تلیانەی نانی هەرداوە، باشە، نان زۆرە، خورماش هەیە، ئەدی مریشک؟ لەبەرخۆوە دەڵێ:

ئاسانە، دەڵێم: دایە، حەزم لە گۆشتە.

دەڵێ: ئێ لۆ راوەستای؟ دە بڕۆ مریشکەک بکوژەوە.

ئەوە کوشتمەوە، بڵێم بۆ کێی دەبەم! نابێ... ئەوەش ئاسانە، دوای کوڵانی پێش تێکردنێ، لەگەڵ دوو پشیلە رێکدەکەوم، رێکی دەخەم.

چێشتانە، ئێستا دایکی لەو ماڵە بێتەوە، باسی مریشکی لەگەڵ دەکاتەوە، وا هاتەوە، ئەوە چیە بە دەستیەوە؟ لەگەنێکی گەورە گۆشت!

ماڵێک کوڕیان لە سەربازی هاتۆتەوە، جوانەگایەکیان بۆ لە عەرد داوە.

ستی دەڵێ:

دایە هەمووی لێنێ، بەینێکە گۆشتم نەخواردووە.

دایک:

کچم، ئەدی لۆ زوو وات نەدەگۆ، مریشکمان دەکوشتەوە.

کچ:

حەزم لە گۆشتی جوانەگا بوو.

دایک:

هەر ئێستا، دەیخەمە سەر ئاگر.

ستی پشیلەکانی لە بیر نەکرد، بۆ خورما و نانەکەش، شتێک دەبینێتەوە، تەماشای ئاسمان دەکات، سامالێکی شینە، لە بەری دوندی ئاشیباوە، چەند پەلە هەورێکی رەشی گچکە هەر هێندەی بزنێک دیارن، هی ئەوە نین یەک بگرن و تاوە بارانێ داکەن، ستی لە بەر خۆوە دەڵێ:

کورە ئەشقیا، خۆ مەرج نیە لە کاری ئاسمانیش بزانی!

دوور لە چاوی دایکی دەسرۆکەی دەرهێنا و تێر بۆنی کرد و جوان لە پیتی ناوی ئەو و خۆی وردبۆوە، خستیەوە ناو مەمکۆڵان.

بەرە بەری نیوەڕۆیە، بۆنی گۆشت کۆڵان کۆڵان دەڕوات، سەرێکی لە ماینەشێ دا:

شێ، گیانەکەم، کەمێکیدی، بەرەو دوندی ئاشیبا، بۆ لای کورە ئەشقیاکە...

مایینەشێ وەک بڵێی ئەو دەرچوونەی بە دڵ نەبێ، نەرمە حیلەیەکیشی بۆ نەکرد.

ستی لە تەویلە هاتە دەرێ و تیچاوێکی دا چیا، لە سەری ئاشیباوە گەواڵەیەکی رەشی هێنا، چ گەواڵەیێ، هیچ ساڵێ لەو کەژە، ئاسمان گەواڵەی وای نیشانی زەوی نەداوە، ستی دڵی لەرزی.

هەوری رەشی هێنا و دنیا رەش داگەڕا و دایکردە بارانێ.

- کچم، وەرە نان بخۆین...

+ راوەستە، جارێ.

ستی لە بەر بێرایی راوەستایە، چاوەڕێ دەکات خۆشی کاتەوە.

- کچم، وەرە، دەڵێێ بارانت نەدیوە، وەرە ساردبۆوە.

+ تۆ بخۆ، من دوایی.

- ئەوە مابوو! ئەدی نەتدەگۆ، لۆ گۆشتی وا شێت دەبم؟

+ دایە، بە بۆنەکەی تێر بووم، تۆ بخۆ، بەشی من و بابم هەڵگرە.

- بابت نایەتەوە، ئەدی نەیگۆ حەفتەیەکم پێدەچێ!

ستی برژانگی لەو دڵۆپە درشتانەی باران نابێتەوە، وا هەست دەکات کوچکە بەردن و بە سەر دڵی ویدا دەکەون.

دایک ناوە ناوە دێتە لای و دەست لە ملی دەکات، بێتە ژووری و نانەکەی بخوات، بەلاشە، چاوی ستی بە باران بە ئاسمانەوە هەڵواسراوە، ئاوڕیشی لێناداتەوە.

- کچم وا عەسرە، هەستە، بە من بڵێ تۆ چیت لەگەڵ ئەو بارانە هەیە؟

+ زۆرم رق لێیە، بۆیێ بە دیاریەوە دادەنیشم.

- کەسێ رقی لە شتێ بێتەوە، لێی دوور دەکەوێتەوە یان بە دیاریەوە...

+ من لێی دوورناکەومەوە.

دایک لە تەنیشتی دانیشت، بەینێ دایە بێدەنگی و لەگەڵ وی لە بارانی روانی:

+ ماینەکەم، پێمبڵێ، تۆ بۆ رقت لەو بارانەیە؟ ئەوە نوێیە...

- من ئەوساڵ رقم لە بارانە، حەزناکەم یەک دڵۆپ بێتە خوارێ.

دایک مستێکی توندی لە سینگی خۆی دا:

کچەکەم تۆ شتێکت بە سەر هاتووە، لە منی دەشاریتەوە.

چوو نیمدەرەیەکی بۆ هێنا:

ها هەر ئەوە بخە بن خۆتەوە، تا بزانین....

ئەو بـارانە چ پێنـاچێ وا زوو لێبکـاتەوە، چ سـاڵێ لەو دەمەی ساڵ هەور و بارانی وام نەدیوە.

باران لێناکاتەوە، دایکی وا دەستنوێژی ئێوارە دەشوات، ستی هەر وا بە دیار بارانەوە.

نـانی بە چەلاوەوە خـوارد، بە زۆر یەک دوو پشـکە گۆشـتی گچکەی خستە زاری، هەستی دەکرد بەردن، بێ کورە ئەشقیا بۆی نەدەچووە خوارێ:

داخوا لە کەیەوە، گۆشتی نەخواردووە، تۆ بڵێی چاوەڕێی کردبم!

دەنگی باران نەما، ناوە ناوە دێتە دەرێ و تەماشای ئاسمان دەکات، ئەستێرەیێ دەرناکەوێ، رۆژ بۆوە، باران دەستیپێکردەوە، شەو داهات، باران لێناکاتەوە.

چوار شەو و چوار رۆژ لێینەکردەوە و هەر هەور و لێڵ بوو، سەری پێنجەی بنی روونکرد، لە سەری ئاشیباوە، لچکێکی ئاسمان دەرکەوت.

لەو دوو رۆژەی دوایی دایکی بە زۆر پشکە گۆشتی دەخستە زاری ستیەوە:

بخۆ، کچم بخۆ، دوایی تێکدەچی، بە من بڵێ بۆ کێت هەڵگرتووە؟

ستی:

دایە، واز لەو قسانە بێنە، دەبێ بۆ کێم هەڵگرتبێ!

دایک:

نازانم، دڵم شتێ دەڵێ، بەڵام تێیناگەم.

## ١١

ستی، زینی هێنا، ماین سەرەتا خۆی نەدەدا بەری، ملەی کرد، ئاخر شتی وای نە دیتبوو، پشتی وی هێ لە ستی، چ شتی وێنەکەوتبوو، بەڵام کاتی ستی دەستی بە بژی داهێنا و کەمێ گوێی خوراند، مێ بوو...

دایک دەڵێ:

ئێ، ئەوەم بە دڵە، سوار بە زینەوە سوارە، دە لغاوەکەشی لە دەو کە.

ستی دەڵێ:

نایەوێ، قەڕاسە و هەوساری بەسە.

ستی بۆ هەڵگرتنی کەلوپەلەکە دەبوو وا بکات، جگە لەوەش بیریکردەوە، لەمەو دوا بارانە و بێ زین سواربوون باش نیە، ماینی زین کرد و چوو دانیشت، چاوەڕێی کرد دایکی بەلایەکدا بچێ، دایکی ستی رۆژی جارێ هەموو ئاوایی نەکات، ناحەوێتەوە:

- ها، ماینەکەم ناڕۆی؟

+ نا، جارێ نا.

- ئەگەر دەرچووی، دەرکە جوان داخە.

+ برۆ، خەمت نەبێ.

هەندێ قەسپ و چەند نووردووە نانێک و مریشکەکەی هێنا، ئەو مریشکەی پێش کەمێ لە کن دایکی چیرۆکی پشیلەکەی بۆ هۆنیبووەوە و تەنها باڵەکانی هێشتبۆوە، خستنیە توورەگەیەکەوە بە تەرکی زینەوەی کرد و بازۆ.

ئاسمان وشک و زەوی تەڕ، زەوی رەباس بووە. لە شوێنی چەقێن و بەردەلان نەبێ، کەڵکی غاری نیە، ستی ئاوڕدەداتەوە، لە چوار پەلی ماینەوە، چ قوڕێ هەڵدەستێ، بە ئاسمانێدا دەچێ و دەکەوێتەوە.

تەواوێ لە خوار کانی، لە دوورەوە بەژنێ باریکی دی، لە سەر بەردێ راوەستابوو، کەمێ لە دوورە وی لە سەر بەرزاییەک دابەزی، توورەگەی لە زین کردەوە، بەرەو یەک هاتن، هەردووکیان نیوە ئامێزیان بۆ یەکتر گرتەوە، کاتێ گەیشتنە یەک، دیارنەبوو چ هێزێکە دەستیانی شلکردەوەو شۆڕبوونەوە.

بەرانبەر یەک راوەستان، نزیکن هەناسە دەگاتە هەناسە، تاوێ چاویان لە چاوی یەکتر بڕی، رەنگە هەردووکیان لەیەک سات چاویان داخستبێ.

لە تەنیشت یەک لە سەر بەردێکی چۆکێ بڵندی درێژووکانی کە دەڵێی تایبەت بۆ ئەوان لەوێ داندراوە، دانیشتن، کەریم کەوتە لای

راستی ستی، دەستی بە نیازی خستنە سەر شانی کەمێ بزووت، داینایەوە و گوتی:

کیژێ، ئەوە لۆ خۆت وا لە قوڕ هەڵێناوە، بچیەوە ماڵێ، ناپرسن کێ....

ستی چاوێکی بە خۆیدا گێڕا:

ئای، ئەو ماینە چی لە من کردووە؟ لە ماڵێ پرسیاری وا لە من ناکەن.

- نەدەبوو بەو تەڕ و تووشیە بێی.

+ چاوەڕێ نەبووی؟

- با، بەڵام نامەوێ لە سۆنگەی منەوە تووشی شتێک بێ.

ستی بە پێکەنینەوە:

+ نا، بۆ لە بەر تۆ، ئێرە جێی منە و زوو زوو دێم.

- دەزانم...

+ تۆ دەمێکە من دەناسی؟

- لەوەتەی بە ماینەشێوە دێیە ئەو بنارە، ئەدی تۆ؟

+ لەوەتەی بە....

ویستی بڵێ لەوەتەی بەژنتم دیوە، گێڕایەوە و گۆڕی:

لە سەر کانیەکە.

کەریم ویستی دەست بخاتە سەر رانی، شەرمی کرد، پرسی:

تۆ تەمەنت چەندە؟

ستی کەمێ بیریکردەوە:

بە قسەی دایکم بێ دوو سێ ساڵ لە حوکمەتی بەغدا گچکەترم.

کەریم هەر دەپەنجەی پێکەوە کەوتنە جووڵە، وەک بڵێی شتێ بژمێرێ:

ئەها، ئەگەر کوڕ بایت، زۆرت نەما بوو ناوی سەربازیت بێ.

ستی پێکەنی:

باش بوو، کوڕ نەبووم.

کەریم کەمێ سەری لێ خوارکردەوە و چاوی لە چاوی بڕی:

+ کچێ، ئەگەر تۆ کچ نەبای، من....

ستی سەری داخست، لە شەرما لێوی لەرزی:

دە تۆ بە من بڵێ:

- لە مووسڵەوە، چۆن بێرە کەوتیەوە؟

+ نەمگوت بە هۆی چاوی تۆوە، چاوی تۆ بۆ من ئەستێرەی بە ئاشیبا کەوتنەوەیە.

ستی هاتە سەری خۆ بە ئامێزی دادا، هاتەوە سەرخۆ:

دیاریەکەت زۆر جوان بوو، منیش دیاریەکت بۆ دەهێنم، بەڵام تەنها لە شار هەیە، هەر دەبێت بە خۆشم بچم.

کەریم بە ئاستەم سەری پەنجەی گەیاندە سەر شانی ستی و وەکات کێشایەوە:

جوانترین دیاری تۆ، خۆتی، ناوە ناوە بتبینم و بەس، ئێستا هەستە بڕۆوە، درەنگە، بە قوڕ و باران مەیە، سەر زینیشت جوان لێدێ، ئەی بۆ لغاوی پێوە نیە؟

ستی بزەیەکی لە سەر لێو نیشت، هەر کێ با لە جێی کەریم، لێوی پێوە دەنا تا ڕۆژی پەسڵانێ دەیمژی و لێینەدەکردەوە، گوتی:

مایینی من لغاوی ناوێ، زمانی من دەزانێ و لە بن فەرمانی منە، بڵێم: بوەستە،

وەکات دەوەستێ.

کەریمیش بزەیەکی شیرنی بۆ کرد و گوتی:

منیش دێمە بن فەرمانت، بەڵام زۆر رامەتەرێنە.

ستی بە بزەیەکی شیرنترەوە:

پیاوی ئەشقیا، ناکەوێتە بن فەرمان.

کەریم کەمێ داما:

ئەدی پیاوی ئەویندار؟

ستی هەستیکرد بەرگەی نەما، لە سەر ئەوەیە خۆی باوێتە ئامێزی، یەکسەر بەرەو ماینەشێ پێی لە ئاوزەنگێ ناو خۆی هەڵدایە سەر زینێ، بەر لەوەی تاویدا:

کوڕە ئەویندارەکە، زۆر وریای خۆت بە، زوو دێمەوە لات.

- چاوەڕێتم.

+ ئاشیبا بتپارێزێ.

ماینی تاو دا، گەیشتەوە نزیک ئاوایی، رۆژ لە سەر دوندی ئاشیبا بە لای کلکەی چیادا تەواو لاربووەتەوە.

* * *

پایز چوو، زستان گەیشت و رۆیشت، لە بەهاریش وا گەیشتە جۆزەردانێ، لەو وەرزانەی بارین، بە بن بەفر، بە بن باو بۆرانێ، حەفتەی جارێ دوو، ستی و ماینەشێ، بۆ ژوانێ، ژوانی کوڕە ئەشقیا هاتوونەتە سەر کانی ئەوین و بە بناری ئاشیبادا هەڵزناون،

لەو ژوانانەش، ماینەشێ دیدڤانە، نە دەستگوشینێ، نە ماچێ، نە راموسانێ، هیچ، هیچ.

لەو وەرزانەی بارین ئەوینی ستی و کەریم، شەو دوای شەو بڵێسەی دەدا، وێنەی ئاگرەکەی سەری ئاشیبا بڵێسەی دەدا، ئاگرەکەی ئەوێ تەنها شەوێ بوو، بەڵام هی ئەوینی ئەمان کێ دەزانێ دەکوژێتەوە یان... ئاگری سەر ئاشیبا بۆتە جێی باس و خواسی ئاوایی، وەرزێ بە سەریدا تێنەپەڕیوە وا کەوتە ناو هەقایەتی شەوان، لێ ئاگری ئەوینی کەریم و ستی هێشتا کەس هەستیپێنەکردووە.

ستی زۆر دڵی بە باسی ئاگرەکەی ئاشیبا خۆش دەبوو، حەزی دەکرد چەندی زووە بکەوێتە ناو چیرۆک و بەستە و حەیرانەوە، ئاخر ئاگرەکەی ئاشیباشی بە تیشکێ لە ئاگری ئەوینی خۆی دەزانی.

هەموو سەر لە ئێوارەیێ، بە دەست خۆی نەبوو، دەهاتە سەر کۆسپەی دەرکە و روو لە ئاشیبا تاوێ رادەوەستا، دەیڕوانیە جێی ئەو ئاگرەی شەوێ تا رووناکایی کەوتە چیا بڵێسەی دا، ئەو ئاگرەی هەموو ئاوایی سەرسام کرد، ئاخر هیچ کەسێک و لە هیچ سەردەمێک و لەو دەمەی ساڵ ئاگری وای لەو شوێنەی چیا نەدیتبوو، لە هەقایەت و ئەفسانانیش نەیانبیستبوو.

دوا رۆژی رەشەمێ بوو، سەر لە ئێوارەی خاکەلێوە، ستی زوو ئاگرەکەی دی، ئاوایی هاتنە دەرێ، بووە هەرا:

هاواره، سەری ئاشیبا ئاگری گرت.

ئاگر تا دێ گەشتر دەبێ، ماڵنووستنانە، ئاشیبا نەکوژایەوە، ئاسمان هەوری نارد و دایکردە نەرمەبارانێ، ئاشیبا جوانتر بڵێسە دەدا، مەلای ئاوایی کەوتە سەلاوات لێدانێ، ئاشیبا گڕی گرتووە، ناکوژێتەوە، ئاوایی ترسیان لێنیشت، وێدەچێ نیشانەی هاتنی کارەساتێ بێت، ئاشیبا ئەوشۆ پەرجووە، ئەو شەوە لە ترسان کەس خەو نەچووە چاوی، ستیش نەخەوت، بەڵام لە ترسان نا، لە خۆشی، تەنها ئەو دەیزانی ئاگری ئاشیبا، ئاگری کەریمە، ئاگری ئەوینە، هی نەورۆزە.

رۆژی پێشتر کەریم گوتبوویە ستی:

لە شار، لە سەر قەڵاتێ، لە شەوی نەورۆزێ ئاگر دەکەنەوە، منیش سبەی ئێوارێ لە سەری ئاشیبا ئاگرێک دەکەمەوە و لە بەر چاوی تۆ تا رۆژ دەبێتەوە بە دیاریەوە دادەنیشم.

ئەو شەوە ستی بە دیار ئاگرەوە بە دەنگی نەرم حەیرانی گوت، بابی لە ماڵێ نەبوو، دایکی گوێی لە دەنگیەتی بەڵام باش لە وشەکان تێناگات، چەند جارێ گوتی:

کچم، دە تۆزی ئەو دەنگە نەرمەت هەڵێنە، دا بزانم چ دەڵێی؟

ستی، نزمتر لە جاری پێشی، تێیهەڵکرد:

**ئاگرە، دایێ، ئاگرە**

ئاگر ل سەرێ دوندی ئاشیبایە

نە ئاگری دزان

نە هی دینان

نە هی شوانان و ئەشقیایە

ئاگرە، دایێ، ئاگرە

نە هی جندان

نە هی خێوان

نە رووناهی پێغەمبەرانی خودایە

ئاگرە، دایێ، ئاگرە

بە چ هەوران ناهێتە دامرکانێ

ئاگرێ ئەوینە، هێ دڵە

دڵی کەریمی منە

ئەوشۆ لە سەرێ ئاشیبای لۆ ستی داگیرسایە.

دوای ئاگرەکەی ئاشیبا، ستی هەر کەرەتێ کەریمی دەدی، شتێ لە سەربردەی ئەو شەوە و دواتری ئاوایی بۆ دەگێڕایەوە کە بە پەرجووی خودای تێگەیشتوون و ئێستاش وەک رازێ ماوەتەوە و

کەس سەرەدەری لێ دەرناکات، بەڵام باسی حەیرانەکەی خۆی بۆ نەکرد، ئەو حەیرانەی هەموو شەوان لە بەر خۆیەوە، بۆ خۆی دەگوتەوە، ستی جارێک پێیگوت:

- بۆچی ناوە ناوە ئاگرێکی وا ناکەیتەوە؟

+ نابێ، جادوویی ئەو ئاگرە لەوەیە کە تەنها لەو شەوەی ساڵ بکرێتەوە.

لەو سێ وەرزەی بارین، ستی فێری تفەنگهاوێژی و نیشانشکێنی بوو، کەریم لە فێرکردنی وەستا بوو، ستیش لە فێربوونی، شاگردێکی بێ هاوتا، فێربوو بە پێوەش نیشان بپێکێ، سێرەگرتن و هەناسە راگرتن و پل پێوەنان لە دوای کەریم هەر لە خۆی دەهات.

ستیش ماینەشێی بۆ کەریم بار هێنا، زۆر ماندوو بوو تا وایکرد ماینەشێ مل بدا کەریم پێ بخاتە سەر زینێ، ئاخر ماین رێی نەدەدا کەس کەس، پێ بخاتە سەر پشتی، تەنها ستی و بەس هەر کەسێ بە نیازی سواربوون لێی دەهاتە پێش، هەڵدەستایە سەر پاشوو، پڕی دەدایێ و تێیهەڵدەدا، جێ ددانی ماینەشێ ئێستاش بە شانی دوو سێ کوڕی ئاواییەوە دیارە، هەڵەی وایان بەرانبەری کردبوو.

ماینەشێ، ئێستا لەبەر خاتری ستی بۆ کەریم کەمۆ بووە.

## ١٢

بەهار لە سەر بارکردنە، جۆزەردانە، بەڵام لە دڵی ستی نێرینەی بەهارێیە، ئێستا دەگاتە سەر کانی ئەوین، لە دڵی خۆی داینـاوە، شەرم بشکێنێ، خۆ باوێتە ئامێزی کەریم و تـام بکـات، ئەو تـامەی چەند جارێ لە خەونێ لێوی بۆی بـردووە و وەئاگا هـاتۆتەوە، ئەو خەونەی ئەوێ ساڵێ بە کەریمیەوە دی، ئەوڕۆ ببێتە راسـتی، وا لە سەر کانی ئەوینە، ئاوێکی لێ هەڵدەقوڵێ دەڵێی چاوی قرژاڵە:

وا دەکەم شەرمی بشکێ، بمگوشێ و هەزار ماچم لێبکات.

تەواوێ چـاوەڕێی کـرد، نە سـێبەرێ دەرکەوت، نە دەنگێـک، نە خشپەی پێیەک هـات، سـواری ماینەشـێ بـوو، هەڵکشـا، هەڵکشـا، دیتی وا لە بن دوندەوە باڵی گرتووە و دێ، لە پانکەیەک گەیشـتنە یەک، لەسەر تەختە شاخێک، تـۆ بڵـێ تـاتێکی گەورە کە دەتگـوت خوداوەند بۆ نوێژکردنی بە کۆمەڵ بە دەستی خـۆی لەوێ داینـاوە، بەرانـبەر یەک راوەسـتان، پـێ پـێ لێـک نزیـک دەبـنەوە، ئێسـتا نێوانیـان بسـتێک کەمـترە، هەناسـەیان تـێکەڵە، قیـت راوەسـتاون، وەک بڵێـی هەریەکەیـان بەژنـی خـۆی بە بەژنـی ئەویـدی بپێـوێ، سەری لووتی ستی وا لە ئاستی بن چەنەگەی کەریم، بەو پێـوانەیە بێ، بەژنی ستی هەر چوار پەنجە کورتی دێنێ!

له چاویانڕا دیاره، هەر دیتت دەست له کەمەر ئالا و لێو و له به لێوەوه نووسا، دەستی ڕاستی کەریم جوولا، ستی کەمێ کشاوه:

به من بڵێ ماڵەکەت کەوتۆته کوێ؟

کەریم ئەو دەستەی ویستی له کەمەری ستی بئالێنێ، بەرەو بن دوندەکەی هەڵبڕی:

- هۆته، لەوێیه.

+ حەزملێیه ببینم.

- منیش پێمخۆشه مێوانی ماڵەکەم بی، بەڵام تا دەگەیتێ زۆر ماندوو دەبیت، ڕێیەکه زۆر سەختە، جگه له من کەس نەیگەیشتۆتێ.

+ له سەر پشتی ماینەشێش سەختتره.

- نا، با بچین.

هەڵکشان، هەڵکشان، ماینەشێ به دوایانەوه، له بن تیشه شاخێ، ستی چووه بن گوێی ماین، دەستی به بڕی داهێنا و ناولەپی خسته سەر قەپۆزی، زاری له گوێی نزیککردەوه، کەریم نەیبیست چی پێگۆت، ئیدی ماین له جێی خۆی ڕاوەستا.

هەڵکشان، هەڵکشان لە هەندێ جێ بە چنگەڕنێ، کەریم زوو زوو ئاوڕی لێدەداتەوە، دەبینێ ستی لە سەر کەوتنێ لەو گورجترە، لە شوێنێک، کەریم گوتی:

دەستت بێنە با نەکەوی.

ستی پێویستی بە دەستگرتن نەبوو، بەڵام قسەی وی نەشکاند، دەستی راستی خستە دەستی چەپی کەریمەوە، ستی ئاگای لە کەریم نەبوو لەو دەستگرتنە چ هەستێکی هەیە، بەڵام خۆی، وای لە خۆی! حەزیدەکرد ئەو دەستە لە ناو دەستە هێندەی رێی گەیشتنە بەرزترین دوندی دنیا درێژ بێتەوە، دوندی ئاشیبا بگاتە ئاسمان و هەرگیز نەیگەنێ، بەو با تا رۆژی پەسڵانێ دەستی لە ناو دەستی کەریم با، کاتێ گوتی:

ئەوەشماڵەکەم.

وەک لە خەونێک بەربووبێتەوە وا بوو:

ئێرە کوێیە؟!

کەریم بە هەناسەبڕکێوە:

دانیشە، پشووێ بدە، ئاوت بۆ دەهێنم.

لە سەر دەرگای ماڵی کەریم دانیشتوون و تەماشای دنیا دەکەن، بەر لەوەی بچنە ژوورێ کەمێکیدی هەڵکشان، لێرەوە، دنیا دیارە، ئاسمان شین شین، دنیا روون روون گەردێکی پێوە نیە، کوێت

دەوێ دیارە، ستی یەکەم جارە دنیا وا بە پان و پۆڕی ببینێ، کەریم، ستی ناوی چیاو چۆلان لە کەریم دەپرسێ، کەریم ناوی هەندێکیان دەزانێ، ستی دەپرسێ:

ئەدی شار لە کیهە راستە؟

کەریم کەمێ بە سەری پەنجە لە شار دەگەڕێ:

ئەها، سەیری جێی پەنجەم بکە.

ستی سەری دەخاتە سەر شانی و لە راستی پەنجەی دەڕوانێ، کەریم دەڵێ:

شەوان ئەگەر هەور و لێڵ و تەم نەبێ، رووناکایی شار دیارە.

ستی:

من لەو رۆژانە دەبێ بچمە شار، بۆ دیاریەکە، ئا، ئەدی شاری مووسڵ کەوتۆتە کیهە لا؟

کەریم روو وەردەسووڕێنێ:

ئەها ئێرێهێ.

ستی:

رێی مووسڵت بۆم نەگێڕایەوە!

چاوەڕێی وەڵامی نەکرد:

+ ئەدی ئاگرەکەت لە کوێ کردەوە؟

– ئەها لە سەر ئەو بەردە تەختێهێ.

+ دەی با بچینە ماڵەکەت.

دەرکە بە سەر هەڵدێرەوە، کەوتۆتە تەنیشت گابەردێ، دەرکە بازنەییە، شتێ لە کونە گورگ گەورەتر، کەریم گۆتی:

لە دوام وەرە.

بە گاگۆڵێ بە دوایدا چوو، نزیکەی گەز و نیوێ وا رۆیشت، دیتی کەریم قیتبۆوە، ئەویش هەستاوە، سەرەتا بەر چاوی خۆی نەدیت، بەرە بەرە رووناکبۆوە، هۆدەیەکی بازنەیی، بە دانیشتنەوە، جێی شەش حەفت کەسی لێدەبێتەوە، لە لایەکەوە چەپکێ رووناکی لە شێوەی لایتێکی کز دێتە ژوورێ، کەریم قسان دەکات، بەڵام ستی وەک بڵێی تاسابێت، تێیناگات چ دەڵێ، لە لایەکی هۆدە هەندێ قوونکە فەردە و پرێسکە و هیربار و نوێن وا بە سەر و تەنیشت یەکەوە.

کەریم نیمدەرەیەکی لە سەر پارچە حەسیرێک راخست:

+ پێڵاوت داکەنە و دانیشە.

– ها! دانیشم!

+ دەڵێی ماڵەکەمت بە دڵ نیە؟

- با...

له ته‌نیشت یه‌ک روو له کولانکه‌ی تیشک دانیشتن، که‌ریم بۆ ستی گێڕاوه له‌گه‌ڵ براده‌رێکی که ناوه ناوه سه‌ری لێده‌دات و خواردنی بۆ ده‌هێنێت، له ماوه‌ی ده دوازده رۆژ ئه‌و هۆده‌یان دروستکردووه و ته‌نها ئه‌ویش، پێده‌زانێ.

+ له‌و ساڵه هه‌ر له چیا بووی، نه‌چوویه‌وه ده‌شت و ئاوایی؟

- با، سێ چوار جار به‌و دیودا، دیوی بازاڕگه شۆڕبوومه‌ته‌وه.

+ هه‌ر ئاوا، یان...

- چوار پێنج جه‌ندرمه‌م ته‌مبێ کرد.

ستی بیریکرده‌وه، به‌ر له ماوه‌یه‌ک بیستبووی که ئه‌شقیایێ په‌یدابووه، به ناو جه‌ندرمان که‌وتووه، بابه‌تی گۆڕی:

+ ئه‌و ساڵ به تاقی ته‌نێ لێره بووی؟

- نا، به ته‌نێ نه‌بووم.

+ براده‌ره‌که‌ت، به شه‌وان دێته لات؟

- نا

+ ئه‌دی؟

- تۆ، تۆ هه‌میشه له لام بوویت.

ستی فرمێسکی هات، بەڵام نەیهێشت کەریم هەستی پێبکات:

+ کەی لە ئاشیبا دێیە خوارێ؟

– بەو زووانە، هەینێش...

گێڕایەوە، گوتی:

+ کیژێ، خۆ درەنگت نیە؟

– نا، دەڵێی دەتەوێ زوو بڕۆم!

کەریم ئاهێکی هەڵکێشا:

ئەگەر بە دڵێ من بێ، لێرە ناڕۆی و لێرە پێکەوە دەخەوین.

ستی دەیویست، دەست لە ملی بکات، کەریم دەستی خۆی پێش خست، دەستی راستی خستە سەر شانی، دەستی چەپییشی گەیاندە سەر سینەی، لێو گەیشتنە یەک، بەرکۆژە ترازا، ماچ ماچ، لێو مژین و مەمک گوشین.

کەریم هەستی کرد، بەرگەی نەما، زۆری لە خۆی کرد و لێوی لە لێوی کردەوە، دەستی لە ناو سینەی دەرهێنا، لەگەڵ دەستی پارچە پەڕۆیەک هات، تەماشا دەکات، دەسرۆکەکەیە، بۆنی کرد و خستیەوە نێوان مەمکان، ستی تەواو شل و خاو بووە، کەریم تێهەڵچۆوە، وەها یەکتریان دەگوشی، چووبوونە ناو یەکتر و بووبوونە یەک، کەریم تەنها ئەوەی لەبیرمابوو کە نابێت لە ناوک

بەرەو خوارێ، جارێ هـی وی نـیە و نابێـت بە لایـدا بچـێ، حـیلەی ماینەشێ ستی لە راموسان کرد، هەستاوە، کەریم پرسی:

+ حیلەی چی بوو؟ هی بە دیارکەوتنی شتێک؟

- نا، حیلەی درەنگەوتنی من.

بە سێ ماچی قووڵ قووڵ ماڵاوایی کرد.

ماین دیاربوو زۆر تینوو بوو، بێ پرسی ستی لایدایە سـەر کـانی ئەوین، ستی لەوێ نیشتەوە، ئاخر لە سەر دەرگای ماڵی کەریمەوە هەسـتی کـرد، بـاڵی گـرت، بە سـەر زەوی و زیـنەوە نەمـا، بە ئاسـمانێدا هـات، ئاسـمانی کـرد، دنیـا گەڕا، لە سـەر کـانی ئەویـن نیشـتەوە سـەر زیـن، دابەزی، دەسـتی لە ملـی مـاین کـرد، ویسـتی ماچی بکات، نەیکرد لە بەرخۆوە گوتی:

نا، با جێ ماچی ئەوی پێوە بمێنێ.

فیکەیەکی درێژی ئاوخواردنەوەی بۆ کرد و گوتی:

شێ، شێی من، گیانەکەم بخۆوە، تا زگاو دەبـی لە کـانی ئەویـن بخۆوە، وەک من بخۆوە.

ماین دڵی نەشکاند و دیسان هەردوو دەستی کەمێ نووشتاندەوە و زاری بە کانیەوە نـا، سـتی، دەخـوازێ زوو بگـاتە بەر ئـاوێنە تـا رووخساری خـۆی ببینـێ و تەماشـای جێـی ماچـان بکـات، سـەیری سـینەی خـۆی کـرد، بەرکـۆژەی دانەخسـتبۆوە، لە سـەر

مەمکەکانیەوە، جێ پەنجە و لێوی کەریمی دیتەوە، دەستی گێڕا، دەسرۆکە مابوو، دایخستەوە و خۆی هەڵدایە سەر زینێ، هێشتا بە بنارەوە بوو، سێ چوار سواری دی، رووە و چیا دێن، نزیک کەوتەوە، ناسینیەوە، ئاغا و دەستەکەی بوون، بابیشی لەگەڵیانە، ئاغا بە رووێکی خۆشەوە:

ها ستی، هیچت راو نەکردووە!

ستی لێوی هەڵقرچاند:

من بۆ راو ناچمە چیا.

ئاغا:

دەزانم، هەر وا وام گوت.

ستی رووی لە بابی کرد:

بابە، دەچنە راوێ؟

باب:

ئا، کچم، بڕۆوە، ئاگات لە خۆت بێ.

مایەنشێی تاو دا، دوای کەمێ، هێوری کردەوە، دیتی سوارەکان رێک رووە و ئاشیبا هەڵکشان، راوەستا، تا نزیک کانیەکە لێوەی دیارن، لەوێوە بزر بوون، دڵی خورپەی کرد.

هێور هێور، بەرەو ئاوایی هاتەوە و ناوە ناوە ئاوڕی لە ئاشیبا دەدایەوە و دڵی هەزارەی دەکرد، تا لە ئاشیبا دوورتر دەکەوێتەوە، دڵەکوتەی پتر دەبێ، ماچ و راموسانی لەبیرنەما:

ئەوانە هەستیان بە شتێک کردووە، ئەدی بابم بۆ لەگەڵم ئاسایی بوو؟

نا، هەستیان بە هیچ نەکردووە، بەڵام هەستدەکەن، بدەنەوە رێی راستی ئاشیبا، شوێنپێی ماینەکەم دەبیننەوە، بە شوێنپێ دەچنە بەر دەم ماڵی ئەو و ئاشکرا دەبێ...

چ نیە، با ئاشکرا بێت، بەس هیچ لەو نەکەن.

نا، کەریم رێوانە، لە دوورەوە دەیانبینێ و چارەی خۆی دەکات.

ئەدی ئەگەر...

گەیشتەوە ماڵێ، تا چیا کەوتە تاریکیەوە، لە بن بێرایی روو لە ئاشیبا دانیشت، دایکی ستی تۆ بڵێ ژنەی خەونـاوی، چەندی دەوروسوڕی دا، هیچ، ورتەی لێوە نەهات، دەنگی بابی نەهاتبا، شەوی لەوێ دەکردەوە.

## ١٣

ژنەی خەوناوی، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

کورم داستاننووس، ئەوەی دەیڵێم، وەک خۆی بینووسەوە.

من ئەو ئێوارەیە دەبوو هەستمکردبا ستی کەینوبەینێکی لەگەڵ ئەو راوچییەی بناری ئاشیبا هەیە، لە تەنیشت بابی دانیشتبوو، لە بن چاوانەوە، بێوەی ئەو هەستپێبکات تەماشامدەکرد، کاتێ بابی باسی ئەو راوچییەی دەکرد، ئەو هەوڵی دەدا بە سەر خۆی نەهێنێ، بەڵام دەمدیت، زاری بەش کردبۆوە، خواخوای بوو چەندی زووە بگاتە کۆتایی و بزانێ چارەنووسی راوچی بە چی گەیی، من چەند هێڕ و هوڕ بووم هەستمپێنەکرد.

گێڕانەوەی بابە بەرازەکەیم جوان وەک خۆی لەبیرە، دەڵێی دوێنێیە، وەک ئەوەی کەوتنە خوارەوەی بازەکەشم بە چاوی خۆم دیبێ وایە:

لە بناری ئاشیبا، بەو دیودا، دیوی رۆژاوا، نەرم نەرم دەڕۆیشتین، باڵدارێ لە بڵندایی ئاسمانێ لە سەر سەرمان دەسووڕایەوە، هێند بڵند بوو، نەدەناسرایەوە داخوا چ باڵدارێکە، وەک بڵێی نیازی شتێکی هەبێ، شتێکی لێمان بوێ، سەر سەری بەرنەدەداین، ئاغا گۆتی:

ئەوەی ئەو باڵدارەم بۆ بهێنێتە خوارێ، ئەسپێکی دەدەمێ.

ئەمن گۆتم:

ئاغا، ئەوە کاری نەکردەیە، لە دەستی چ بنیادەمێک نایە.

ئاغا:

دە فیشەکێکی بهاوێژێ بزانە چ دەبێ.

دابەزیم، لە پاڵ تیشە بەردێ کە دەتگوت ملە ئەسپە، نیشانەم لێگرت و تێمگرت، باڵدار خۆی لە گوورە نەبرد، ئەوانیدیش خۆیان تاقیکردەوە، سەیر لەوە بوو، گوللە بە تەنیشتیا دەڕۆیی، باڵدار وەک بڵێی کەڕ بێ، لە باڵ لێکدان و لەنگەرگرتنی خۆی نەدەکەوت، ئاغا دابەزی و گوتی:

بۆ منی لێگەڕێن.

سێرەی لێ گرت، یەک، دوو، سێ فیشەکی هاویشتێ، هیچ، باڵدار هەر وا بە ئاسمانەوە، دەنگێکی لێوەهات، دەنگی باز بوو، بە شێوەیەک وەک بڵێی بڵێ:

بە گونتانەوە.

ئاغا گوتی:

وازی لێبێنن، ئەوە خواردنی بنیادەم نیە.

سواربووینەوە و ڕێی خۆمان گرت، باز هەر وا بە ئاسمانەوە و بە سەرمانەوە، لە هیکرِا دەنگی فیشەکێ هات، هەڵوەستەیەکمان کرد، دیتم باز وا بە تەقڵان دێتە خوارێ، لە نزیکە مە کەوتە زەوی، دیار بوو، هێشتا جوولەی تێدا مابوو، لەو ساتە، لە بستیەکەی تەنیشتمانەوە تفەنگچیەک بە هەڵەداوان هات، کوڕێکی باڵا بەرزی قۆز، دوای چاکو چۆنی:

وا بزانم بازەکە لەو ناوە کەوت.

ئاغا:

+ ئەو فیشەکە تۆ تەقاندت؟

- بەڵێ، ئاغا.

+ تۆ ئێمەت دی کە فیشەکمان پێوەدەنا؟

- نا کەسم نەدی، تەنها گوێم لە تەقە بوو، زانیم بە بازەکەوەی دەنێن.

+ من تفەنگچیی نیشانشکێنم خۆش دەوێ، خەڵکی کوێی؟ چ دەکەی لێرە؟

- هی دیوی قەراجم، هاتوومەتە، ڕاوێ.

+ دەستت وا ڕاستە، یان خوا بۆی هێنایت و ئەو بازەت نەنگاوت؟

- بڵێم چی، ڕەنگبێ خوا هێنابێتی.

+ ئامادەی، نیشانە دابنێینەوە؟

- لە خزمەت دام...

سەرەتا، لە نزیکەوە، چیلکە داری هاوشێوەمان، لە ڕیزی یەکتر چەقاند و یەک یەک چیلکەی خۆمان هەڵدا، دوای چیلکە، دوورتر لە جێی چیلکە، بەردی گچکەی هاوشێوە و هاوڕەنگمان ڕیز کرد، تەنها ئاغا و ڕاوچییەکە بەردی خۆیان پێکا، هەموو جارێکیش، نۆرەی ڕاوچی دەکەوتە دوای ئاغا.

نیشانەی سێیەم، تەواوێ دوور، لە قەد گابەردێکی سپی سپی، جغزێکی کێشا، ئەوە ڕاوچییەکە داییهێنا، گۆڵمە قوڕێکی سووری گرتەوە و لە سەر بەردی سپی، بەو خەتە سوورە جغزەکەی کێشا، بۆوەی جوان دیار بێ، ئاغا گوتی:

ئەوە زەحمەتە، کەس ناییپێکێ

ڕاوچی گوتی:

باوەڕناکەم لە بازەکە زەحمەتتر بێ.

ئاغا کەمێ داما، گرژیەوە:

ئەوەش تاقیدەکەینەوە، دەی وەرن سێرە بگرن.

مـن یەکەم کەس بـووم هاویشـتمێ، شـریقەی هـات، چـووین زۆر دوور لە جغزکە بەردی قرنجاندبوو، هی ئەوانیتریش هەر بەو شێوە، ئێستا ئاغا و راوچی ماون، ئاغا دەڵێ:

دەی تۆش بهاوێژە.

راوچی دەڵێ:

ئاغا، نابێ، چۆن دەبێ پێش ئێوە...

ئاغا:

لە کاتی نیشاندانانەوە، هەموو یەکین، ئاغا و کرمـانج لە گۆڕێ نیە. نەتدی ئەوانەش پێش من...

راوچی سێرەی لە جغز گـرت، هەستمکرد بـۆ مـاوەیەکی گەلەک زۆر هەناسـەی راگـرت، چ تفەنگچـی نـیە چـاو بە سـێرەوە بتـوانێ هێندە هەناسە رابگرێ، تەقاندی.

چووین، دوو پەنجە دوور لە خەتی قوڕ، بە دیـوی نـاوەوە بەردی باش قرنجاندبوو.

تۆرەی ئاغایە، هەرگیز ئاغـام نەدیتبـوو هێنـدە چـاو بە سـێرەوە مابێتەوە، بەڵام نیو هێندەی راوچـیەکە هەناسـەی رانەگـرت، زرمەی لێوە هێنا.

گوللەی ئاغاش دوو پەنجە دوورە لە خەت، بەڵام لە دەرێی جغز، ئاغا دەستی خستە سەر شانی راوچی:

بە راستی نیشانشکێنی، من پیاوی ئەوهام خۆش دەوێ، بەڵام شەرتی پیاوان سێ جارە، سەر و دوو فیشەکیتر، من ئەگەر نەمپێکا، ئەوە هیچ، تۆش ئەگەر نەتپێکا ئەوا یەکەمیان وەکوو هی بازەکە خوا هێناویەتی.

راوچی:

ئاغا، دڵنیام تۆ لە من نیشانشکێنتری، بەڵام جار هەیە خوا نایهێنێ و جار هەیە دەیهێنێ.

ئاغا دوو فیشەکیتری هاویشت هیچیان نەکەوتنە ناو جغزی سۆرەوە، نۆرەی کورە راوچیە، ئێمە لە بن لێوانەوە، نزا دەکەین:

خودایە، وا بکە گوللەی ئەو راوچیە نەدیت و نە ناسیە، نەخەیتە ناو جغزی سۆرەوە، خودایە، هەر بە لای بەردەکەشدا نەچێ.

راوچی، روو لە دوندی ئاشیبا، بۆ تاوێ راوەستا، وەک بڵێی چاکێ، شتێ لەوێ بێت و لێی بپارێتەوە، سێرەی گرت.

چ ببینین! هەردوو گوللەی لە یەک جێ دابوو، ناوەندی جغزی سۆر، سۆر بە قورە سۆرە.

ئاغا دەستی راوچی گوشی:

من شانازی به تۆوه دەکەم، هەر شتێک دەخوازی، بخوازە.

راوچی:

ماڵت ئاوا، پێویستم بە هیچ نیە، تەنها خۆشیی ئێوە.

ئەورۆ لەگەڵ ئێمە بمێنەوە، بزانین شتێ راو بکەین، ئەرێ ناوتم نەزانی.

راوچێ:

کەریم، کەریمی خزمەتکارتان.

+ ماڵت هەیە؟

– لەگەڵ دایکم دەژیم.

ئاغا سەری خستە بن گوێم:

دەڵێی چی ئەو کورە لە دەست خۆمان نەدەین، بیهێنینە ئاوایی؟ وێدەچێ زۆر بوێر بێ، لە تەنگانە بە کەڵکمان دێ.

گۆتم:

ئاغا، جێی خۆیەتی، بە دڵی خۆت.

ئیدی ئاغا زۆر قسەی لەگەڵ کرد، ئاکام هاتە رایێ بێت، لەو رۆژانە ماڵی دێتە ئاوایی.

ئەو شەوە لە دوای گێڕانەوەی سەربردە، سەربردەی کەریمی ڕاوچی، ستی بە شێوەیەک گەشایەوە، تیشکی ڕوومەتەکانی چراکەی ڕووناکدەکردەوە، دەمدی نەینۆکی دەردەهێنا و لە خۆی دەڕوانی، بە شێوەیەک وەک ئەوەی لە سەر کوڵم و لێوەکانی لە دوای شتێک بگەڕێ.

ستی سەر لە ئێوارە و پێش بیستنی سەربردەی ڕاوچییەکەی بناری ئاشیبا لە کوێ، ستیی دوای بیستنی سەربردە و ئەو شەوەی دیار نەینۆک لە کوێ! ناگەنەوە یەک لە هیچ ناگەنەوە یەک، وای ئەو شەوە دڵم خۆش بوو، کە کچەکەمم بەو ڕوو گەشی و دڵخۆشیەوە دی، من چ بزانم، ڕاوچیە نیشانشکێنەکەی ئاشیبا، ئەو ڕاوچییە، هەر بازی ئاسمانێ نا، دڵی ستیی منیشی ڕاوکردووە، ئاخر من بە خەیاڵ و لە خەیاڵیش نەدەگەیشتمە ئەوەی ستی دڵ بە کەسێ بدات، چوونکێ کچێ بوو، جودا لە هەموو کچان، هۆیهای لە کوڕان دەکرد، لە سەر ئەو هەموو جوانیەی خۆی، جوانیی ژنانە، ئەوەی ژن نیە خۆزی بۆ نەخوازێ، کەچی ڕەفتاری، ڕەفتاری کوڕ بوو، هێ لە هەندێش دەیزانی کە ئاغا بۆ خۆی داناوە، چۆن دەبێ بیر لە کەسێکیدی بکاتەوە!

+ کوڕم داستاننووس، قسەکانم جوان بنووسەوە.

– دڵ لە دڵ مەدە، بە دڵی تۆ دەبێ.

## ١٤

**دە پێدا، پێدا، پێدا**

**سوارێ، پێدا...**

**ماینێ سوارێ، سپیە**

**پنتۆک پنتۆک سۆر تێدا.**

**سەرێ من سورمایە، لە وێ سوارێ**

**ل سەرێ ئاشیبای دەر کەتیە بە وێ سپێدا**

**سوارێ، تو بێژە من**

**دلێ تە چ دخازی، چ تو ئینا**

**بۆ وی ئاقاری، ب وێ رێدا؟**

مـــن مەلای داســـتان، ئەو رۆژە بە دیـــار ســـوارەکەی ســـەری ئاشـــیباوە، لە بـــن تیشـــە بەردێ، ئەو لاوکەم بـــۆ هـــات، بە دەنگـــی نەوی، هەر خۆم و بەرد بیستمان، بە دیـار ماینەشـێوە گۆتمەوە و خۆم نیشانی نەدا.

لە دوورەوە ماینەکەم دی، هاتم هاتم، نەمهێشت بمبینـــێ، هەوە ماینەکەی ستی خانە، ئەو کچەی ناوی نام مەلای داسـتان، مـاین و

ستی لە دوورەوە دەناسرێنەوە، ماینەکەی لە خوارێ روو لە بڵندایی ئاشیبا، روو لە ماڵی کەریم، راوەستاوە، ناوە ناوە ئاوڕ لە دەوروپشتی دەداتەوە، دەڵێی ئێشکچیە و ئێشکی لە ئاشیبا گرتووە، لە بن بەردێک خۆم گرت.

کەریم، چما ئەو کچەی دەتگۆ، دڵی بردووم ئەوەیە! لە خۆت خەنی، نەمریت بە دەست خۆت هێنا، نا، نابێ، ئەو کچە سەرکێشە، بە حەزرەتی یووسفیش راوناکرێ، بزانە، کێ ماینەکەی هێناوەتە ئێرە! یان داخوا ستی بە هەڵە، بۆ شتێ، رێی کەوتبێتە ئاشیبا! ئەدی لە کوێن؟ تۆ بڵێی چووبنە ماڵەکە؟ کەریم ماڵەکەی خۆی نیشانداوە؟! تێناگەم.

چەند جغارە خۆرێ لە بن بەردەکە مامەوە، تا نەهاتنە دەرێ و خۆی هەڵنەدایە سەر زینێ، باوەڕم نەهات، ئەو سوارەی مێوانی کەریمە ستی بێت، دوای بەینێک، هەڵکشام، لە دوورەوە:

+ لە کاتێکی باش هاتی.

- بۆ، خۆ خواردنت لێ نەبڕاوە؟

+ نا، هەر حەزمکرد، بتبینم.

کەریم، خۆشی و خەندەی لێدەباری، بێوەی من چ بپرسم و بڵێم، بە وردی پێوەندی خۆی و ستی گێڕایەوە، منیش کە دەمێ بوو، دڵم بۆ ستی لێیدەدا، هەرێم بە خۆمدا، لەو ساتە بە دواوە وەک خوشکی خۆم لێیبڕوانم، هەرێم بردە سەر.

سەربردەی بازەکەش هەر ئەو رۆژە بوو، بە تەنیشت یەکەوە بووین، ئاگامان لێبوو، ئاغا و تفەنگچیانی بازیان دابووە بەر فیشەکان، کەریم گوتی:

ئێستا دەیخەمە بن دەست و پێیان، بەڵام تۆ بڕۆوە با نەتبینن.

من دوورکەوتمەوە، لە زۆر دوورەوە ئاگام لێبوو نیشانەیان داناوەتەوە.

رۆژی دواتر پێکەوتم، کەریم لە گەڵ ئاغا رێککەوتووە، ئەوە بوو من چووم ماڵەکەیم لە کەرێ بارکرد، کەریم نەهاتەوە ئاوایی خۆمان، لە بن ئاوایی ماڵی ستی یەکمان گرتەوە و دواتریش، خەڵک باوەڕیان هات کە کەریم هەڵاتووی سەربازی نیە.

ئەوەشم لەبیرە:

+ تۆ دەزانی، ئاغا ستیی بۆ خۆی داناوە؟

- دەمێکەم بەر لەوەی ستی بیڵێ، من دەمزانی.

+ باشە، ناترسێی شتێ بکات؟ بیرت لەوە کردۆتەوە؟

- نا...

+ ناترسێی، یان بیرت لێی نەکردۆتەوە؟

- هیچیان.

+ برا، ئەوها نابێ.

کەمێ داما، بزەیەکی هاتێ:

قسەیەکم بیستووە، نازانم هی کێیە، دەڵێ:

لە ئەوین، نە ترس هەیە، نە بیرکردنەوە.

گوتم:

بە راستی تۆ باش لێدراوی.

گوتی:

نە سیامەند، نە خورشیدی چاوبەخاڵ وەک منیان بە سەر نەهاتووە.

## ١٥

**چاوێکم بۆ بکێشە**

**لە شێوە و رەنگ لە هی کەس نا**

**تەنها لە چاوی خۆم بچێ**

**نە بە تاو نە بە ئاو**

**نە بە کات، کۆن نەبێ، رەنگی نەچێ**

بە دیتنی وی، مەست و حەیران بووم، لە شار هی وا جوانم نەدیبوو، لە ناو بەگزادان و جوانزادانیش کچی وا جوان نەبووە و نابێتەوە، تا دەست هەڵبڕی کەڵەگەت، کەمەر باریک، دوو چاوی رەشی گەشی گەورە، روومەت سێوی لاسوورە، لێو فستقی، کەپوو قەسپی، گەردن کێل، باسی کوێی بکەم، جوانیی ئەو کچە ناهێتە گۆتنێ، لە بن رەفتەکەیەوە، پرچ نا، کەزۆک بوو بە سەر شانیەوە هاتبوونە خوارێ، لەگەل کچە پلکەکەی هاتنە ماڵێ.

تا دڵ دەڵێ زێ، خوێن شیرین، بە ژەهرەوە دەخورا، زار شەکر، خۆ کاتێ بزەی دەهاتێ بە تۆ با قووتت دابا، چما لە گوند کچی وا هەیە! تا خودای جوانی دەڵێ بەس، شۆخ و وەشتە بوو، هەر کەسێ کەرەتێ ئەو ڤینۆسەی دیتبێ، وەشتی دیتنی دەکات، ئەوجا سادە و بێ فیز، یەکەم جار بوو خۆزگە بخوازم کوڕ بام و ئەو کچە

دەزگیرانی من با، خۆزگەم خواست، تیلمێ لە جوانیەکەی ئەو بام بە جوانیی ئەوەوە.

ئەو کچە گوندیە بەو هەموو جوانیەی خۆیەوە هات و داوای لێمکرد، لە سەر دەسرۆکەیەک چاوی بنەخشێنم، گوتم:

کچێ، چاوی تۆ بە من چۆن دەنەخشێ!

بە چاوی پاڕانەوە، پاڕانەوەیەکی وا، ئەگەر گیانمی خواستبا، نەمدەگۆ نا:

چاوەکم، ئەو چاوەم بۆ بکێشە، دڵم مەشکێنە.

دەستم لە ملی کرد:

گیانەکەم بۆت دەچنم و دەنەخشێنم، بەڵام ئەو چاوە جوانانەی تۆ، نەک هەر بە من، بە هیچ نیگارکێشێ ناهێتە کێشانێ.

بزەیەکی وای کرد، تەنها لە خۆی دەهات:

- دەزانم، تۆ دەتوانی هەموو شتێ بنەخشێنی، ئێ خۆ چاوی من لە هی تۆ جوانتر نیە.

+ کچێ، چاوی وەک تۆم هەبا، دڵم دەهات نیشانی خەڵکی بدەم! دە تۆ بە من بڵێ، ئەو چاوانەی خۆت بۆ کێیە؟

- کاتی بۆت نەخشاندم، پێتدەڵێم.

+ داخوا کەسێ هەیە شایانی ئەو چاوانە بێت؟!

– ئەگەر بیبینی، وا نالێی، دەڵێی ئەو کورە قۆزە چۆن دڵی داوەتە، ئەوە سەر بە ڕشکە.

تێگەیشتم چ ئەوینێ، هەڵیگرتووە و دەیەوێ دوو چاوی خۆی لە سەر دەسرۆکەیەک بنەخشێنێ و بە کورە لاوکێ خۆی ببەخشێ.

ئیدی هەرێم پێدا، ئەوە بوو، گوتم:

سەرەتا دەبێ لە سەر کاخەزێ بیکێشم، پاشان لە سەر دەسرۆکە بینەخشێنم.

گوتی:

باشە، بەڵام توخوا با وەک خۆی بێ، هەر دیتی بیناسێتەوە.

بەرانبەر یەکتر دانیشتین، کەوتبوومە ناو چاویەوە و نیازی خۆم لەبیرچووبوو، ئاگام لە پێنووس و کاخەز بڕابوو، بە دەنگی وی لە دەریای چاوی هاتمەوە دەرێ:

+ کوا، دەڵێی هیچ ناکێشی؟

– با... با... دەڵێم با جوان لێی وردببمەوە.

+ ئا، ئا، چاوەکەم با کتومت خۆی دەرچێ.

ناوە ناوەش دەستی دەخستە سەر لووتی و دەیگۆ:

هەر تا سەرەوەی لووتم دەربچێ.

دانە ڕۆژێکی برد، تا دوو چاوم خستە سەر کاخەز، بەڵام بە دڵیشم نەبوون، چاوی ستی لەکوێ، هی سەر کاخەز لە کوێ! لە چاوەکان ورد بۆوە، بە سەری دوو پەنجە سەری کوڵمی خۆی گرت، ناوە ناوە ئەو جوولەیەی هەبوو:

+ زۆر بە دڵم نیە.

– دەزانم، منیش بە دڵم نیە، ئەدی نەمگوت: کەس توانای کێشانی چاوی تۆی نیە.

پێکەنینێ پێکەنی، من تەنها لە کەوی ناو ڕکەکانی کۆڵانی قەیسەری، قاسپەی وام بیستبوو، گوتی:

+ کچێ، تۆ چ دەڵێی! ئەو چاوانە زۆر لە هی من جوانترن، کوڕە لاوکێی من ببینێ، دەڵێ خۆزگە، چاوی ستی منیش هێندە جوان با.

ستی بەو قسەیە هێندەیدی خۆی شیرین کرد، گوتم:

بزانە، کێشانی چاو لە سەر کاخەز زۆر گران نیە، بەڵام کە لە سەر دەسرۆکە دەیچنی، گەلەک زەحمەتە و کاتەکی گەلەک زۆری دەوێ.

گوتی:

+ چەند؟

– دیار نیە، بە تایبەتی چاوی تۆ، رەنگە چەندان جار بیچنم و هەڵوەشێنمەوە، چەند مانگەکی پێدەچێ.

+ هەر چەندی پێبچێ، با بچێ، گرنگ ئەوەیە لە چاوی خۆم بچێ.

کچە پلکەکەی گۆتی:

هەر کاتێ تەواو بوو، بە هەر رێگەیەک بێ، بۆت رەوانە دەکەم.

لە هەستاندا، ستی پارچە زێرێکی خستە مستم، گوتم:

ئەوە چیە کچێ؟

گوتی:

چاوی من هێندە ناهێنێ!

زۆر هەوڵیدا، لێم وەرنەگرت، بەوە بەرێم کرد کە دوای نەخشاندنی چاو و برۆ، لێیوەرگرم.

زۆری برد، تا دوو چاوی ستیم خستە سەر دەسرۆکە، ئەوە بوو لەو ماوەیەش ماڵی کچە پلکەشی لە شار نەمابوون، باریان کردبووە گوندێکی ئەو سەرەی شار، دوای ساڵێک پتر، رۆژێک بە دیارکەوت و دەسرۆکەی برد و گوتی:

منیش بەینێکە ئاگام لە ستی نیە، هەر هاتوچۆیەک ببێ، بۆی دەنێرم.

ئەوە سەربردەی من بوو لەگەڵ چاوی ستی، چاوەکانی، وای لە چاوەکانی، درەنگانی ئێوارەیەکیش، درەنگانی ئێوارە، بەو شەوە، چاوەکانی دوو ئەستێرە بوون، بە سەر قەڵاتەوە، ئای...

## ١٦

ئەو رۆژەی ماڵی کەریم هاتە ئاوایی، ستی نەیدەزانی لە کوێ خۆی بشارێتەوە، بۆوەی خەڵک ئەو خۆشیە بە روویەوە نەبینن، کە بە ئاشکرا دەریدەخەست گۆڕانێکی گەورە لە ژیانی روویداوە، زۆری لە خۆی کرد، بۆی نەشاردراوە، بۆیە دەبوو دەرنەکەوێ و کەس نەیبینێ.

دوور بە دووری دیتی، لەگەڵ دایکی لە کن دارتووەکە بە لای ماڵی نەنەی خەونزان سووڕانەوە، لەولا، لە پەرگەی دێ، بە دوو سێ رۆژ، بە فەرمانی ئاغا خانووێکیان بۆ قیتکردبۆوە.

حەفتەیەکی نەبرد، کەریم بووە کوڕی گوند و خەڵک وەک هاوگوندیەک لێیان دەڕوانی، هێند گران و سەنگین بوو، هەموو خۆشیان دەویست، لە راستی کچان سەری دادەخست و بەشەرمەوە سڵاوی دەکرد، لەگەڵ ستیش هەروا بوو، ستیش راهات و بە شێوەیەک رەفتاری دەکرد کەس گومانی بۆ هیچ چتێ نەچێ.

ئازایەتی و نیشانشکێنیی کەریم زوو بە ئاواییدا بڵاوبۆوە، بەرە بەرە، ئاوایی ئاوایی، هەردوو دیوی ئاشیبای گرتەوە، کەس نەما ناوی وی نەبیستێ، ناوی وی، لە بەردانەوەی بازەکە و سێ گوللەکەی ناو جغزەکەوە کەوتە سەر زاران، ماینەکەی ستیش پتری ناساند.

ماینەشێ، هێ لە ستی لێنەدەگەڕا سێبەری هیچ کەسێکیشی بێتە سەر پشتێ، خۆ ئەگەر ئەسپێک، نێرەکەرێک لێی نزیک کەوتبانەوە، بە قەمپاڵ و لووشکان دەیکوشتن، ئیدی کەس نەیدەوێرا توخنی بکەوێ، ماینەشێش بە ستیەوە گوند گوند ناویان دەڕۆیی، ڕۆژێک ئاغا، گەنجانی گوندی خڕ کردەوە، گوتی:

هەرکەسێ، ماینەشێ رام بکات و سواربێت نەکەوێ، چ بخوازێ دەیدەمێ، لەو هەمووە تەنها سێ کەس، هاتنە پێش، ماینیان بە زین و لغاوەوە هێنا، ئەوە یەکەم جاریش بوو ماینەشێ لغاو بە دەوی خۆیەوە ببینێ، ستی جڵەوی ماینی دا دەستی بابی، تیچاوێکی دایە کەریم و دوورکەوتەوە.

گەنجی یەکەم هات، چەند جارێ بە دەوریدا سووڕایەوە و فیکەی بۆ لێدا، پێی خستە سەر ئاوزەنگێ، ماین لە خۆی هەڵدا، بە دەوری خۆیدا وەک فرفرۆکە سووڕایەوە، هێندەی نەمابوو، بیخاتە بن دەست و پێی خۆیەوە، گەنج کۆڵی نەدا، دوای کەمێ دیسان پێی خستە ئاوزەنگێ، ماین هەستایە سەر پاشوو، خۆ راوەشاندنێ خۆی راوەشاند زۆری نەمابوو زین بفڕێ، گەنجەیان لەو سەر هەڵگرتەوە، خۆی لە سەر پێ رانەدەگرت.

گەنجێکیتر هات، لە چاوترووکانێ خۆی هەڵدایە سەر زینێ، پێدەچوو ماینەشێ چووبێتە خەیاڵەوە، یان سەری لەو تەڕدەستیەی کوڕە سوڕمابێ، کەمێ لە جێی خۆی چەقی و نەجوولا، لە پڕ هاتە سەر پاشوو، کوڕە دەڵێی کەتیرەیە بە زینەوە نووساوە، ماین لە

سـەر پاشـوو، دەسـتەکانی وا لە ئاسـمانێ، بە دەوری خۆیـدا دەسـووڕایەوە، چ کەسـێ جـوولەی وای لە هـیچ مـاین و ئەسـپێ نەدیتبوو، هەموو چاویان زەق و زاریان بەش بوویبووەوە، کوڕە هەر وا بە سەر زینەوە، ماین ماندوو بوو، دەستەکانیشی هاتنەوە زەوی، هەموو چەپڵەیان بۆ کوڕە لێدا:

دەی، ئێستا تاودە.

ستی لەو سەرەوە، چاوی لێیە، خەم بە دەم و چاویەوە دیارە.

گزوگـوم مـاین چـۆکی دادایەوە، زگـی گەیانـدە زەوی و گەوزی، سوار کەوتە بنـی، گەوزی و هەسـتایەوەو سـوار لەو گـۆڕە راکشـا و لاتە عەردێکی گرت، ئاویان پێدا کرد، بە خـۆ هـاتەوە، دەسـتی بە سینگیەوە، گرتووە، پێدەچێ چەند پەراسووێکی شکابێ.

ستی هەناسەی خۆشی هەڵکێشاو گەشایەوە.

کوڕەکەیدی کشایەوە و نەوێرا خۆی لێدا، ئاغا گوتی:

دەی، کەسیتر هەیە خۆ لێدا؟

کەس نەبوو.

ستی بە لا چاوێ تەماشای کەریم دەکات و سەری لێی سوڕماوە، بۆچی بەشداری لەو پێشبڕکێیە ناکات، ئاغا گوتی:

دەی ئەگەر کەس نەما، با پەرتەی لێبکەین.

کەریم بە شەرمەوە:

ئاغا، دەڵێی چی منیش خۆم تاقیبکەمەوە.

ئاغا:

کوڕە، ئەوە باز و جغز نیە.

کەریم:

با بزانم، یان تێدەچم، یان دەردەچم.

ئاغا:

باشە، بەڵام وریای خۆت بە، خۆ بە چاوی خۆت دیتت...

کەریم، نەرم نەرم بەرەو ماین چوو، تەواوێ بەرانبەری راوەستا، کەوتە لێو جوولان، وەک بڵێی، پێیبڵێ:

بمناسەوە، ئەویندارەکەی ستیم، بە دەردی ئەوانەم مەبە.

چوو دەستی بە بژیدا هێنا، کەمێ بن گوێی خوراند، دڵنیا بوو دەیناسێتەوە، پێی خستە ئاوزەنگێ و خۆی هەڵدایە سەر زینێ و تاوی دا، بە بەردەم ستی دا باڵی گرت، دایەوە لای دارتووەکە و پەڕیەوە ئەو بەر و لە بەرزاییەکە دەرکەوتەوە، تا نزیک گۆڕستانەکە رۆیشت و گەڕایەوە، هەموو ئاوایی هاتنە تەماشاکردنی، باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد، ماینەشێی ستی و سوارێکیتر لە سەر زینی!

له هاتنه‌وه خۆی گرت و ته‌ماشای ستی نه‌کرد، ترسا ئه‌و خه‌ڵکه هه‌ست به شتێ بکه‌ن، به چه‌پڵه‌رێزانه‌وه به‌خێرهاتنیان کرده‌وه، ئاغا گوتی:

به من بڵێ، تۆ چ جادوویه‌کت له ماین کرد، ئه‌وه له بن لێوانه‌وه چیت خوێند؟

که‌ریم به پێکه‌نینه‌وه:

من و جادوو! ته‌نها له خودا پاڕامه‌وه، که دڵی ماینه‌شێ نه‌رم بکات.

ئاغا، سه‌ری بادا:

تێناگه‌م، له‌وه تێناگه‌م، ده‌ی له‌وه گه‌ڕێ بخوازه، حه‌زت له چیه بخوازه.

که‌ریم:

ئاغا، هیچ ته‌نها خۆشیت.

ئاغا:

شه‌رم مه‌که، شتێ بخوازه.

که‌ریم:

ته‌نها خۆشیت.

ئاغا سێ جاران گوتی: کەریم شتەک بخوازە.

کەریم هەر سێ جاران خۆشیی ئاغای خواست.

ئەو ڕۆژە لە ڕووی هەرچی کوڕی ئاواییە، نیشانەی ئیرەیی دیار بوو، ئیرەیی بە کەریم، لە چاوی هەرچی کچی ئاوایی هەیە، بە کچی ئاغاشەوە تاسە دەخوێندرایەوە، تاسە بۆ گەیشتن بە باوەشی کەریم.

ئەو کوڕەی کە ماینەشێ زوو هەڵیدا و نەیهێشت بگاتە سەر زینێ، گوتبوویە کەریم:

+ ئەگەر من لە جێی تۆ دەبووم.

- چیت لە ئاغا دەخواست؟

+ رادیۆ، دەمگۆ ئاغا، رادیۆیەکی وەک ئەوەی خۆتم بۆ بکڕە.

- هەندێکم بێتە دەست، من دەیکڕم و پێکەوە گوێی دەدەینێ.

کوڕەکەیدی، ئەوەی ماین دوو سێ پەراسووی شکاند، گوتبووی:

+ کەریم، من لە تۆ ناگەم، بۆچی داوای شتێکت لێی نەکرد؟

- پێویستم بە هیچ نیە، تۆ لە جێی من بایت، چیت لێی دەویست؟

+ کچەکەی.

- کچەکەی؟!

+ تۆ شێت بوویت، یان لەو وڵاتە نەژیاویت، بیستووتە ئاغا کچ بدەنە کرمانج؟!

- نا، بەڵام ئاغای ئێمە دەیدا.

+ بە چ دەزانی؟

- تۆ ئەو ئاغایە ناناسیت، کاتێ هەرێی دا، دەیباتە سەر.

+ رەنگبێ بۆ ماڵی دنیا وا بێت، بێتە سەر کچ و ئەو شتانە نا.

- ئەگەر لە جێی تۆ دەبووم، ئێستا زاوای ئاغا دەبووم، ئاغا کە هەرێی وا دەدات، داوای ژنەکەشی بکەیت دەتداتێ، تەنها ستی نەبێ.

+ ئەوها کوشتەی ستیە؟

- ئامادەیە هەموو ئاوایی لە سەر ستی بسووتێنێ.

+ ئەوجا ستی ئەوی دەوێ؟

- بە دەست خۆی نیە، نەیەوێ.

+ باشە کەینوبەینێکت لەگەڵ کچی ئاغا هەیە؟

- لە نێوان خۆمان دەرنەچێ! هەستدەکەم ئەویش دڵی بۆ من لێدەدا، بەڵام ترس دەست و پێی بەستووە.

+ گرفتی تۆ زۆر ئاڵۆزە.

- تۆ بە من بڵێ، بزانم، تۆ چیت بەو ماینە گۆت، کوو کەمۆت کرد؟ پێمبڵێ، ئێ، ئەوە خوایە، لە گرەوێکیدی ببەمەوە.

+ من زمانی وی دەزانم.

- فێرم بکە.

+ فێر نابی، جگە لە من کەس زمانی ماینەشێ فێر نابێ.

- دەترسم، تۆ شتێکت..... کورە، ئەگەر.......زۆر ترسناکە..... نەکەی...

+ مێشکی خۆت ئاڵۆزمەکە، هیچ شتێ لە گۆڕێ نیە، من زمانی ماین دەزانم و تەواو.

هەر لەو سەروبەندە، ڕووداوێکیدی پتر ناوی کەریمی بە چیا و دەشتا بڵاو کردەوە و هێندەی نەمابوو، بەرگی ئەفسانەی لە بەر بکەن، هەواڵ بە ئاواییدا بڵاوبۆوە:

ئاغا و تفەنگچیانی، لە بەری ئاشیبا دەور دراون، لە چوار لاوە تەقەیان لە سەرە.

کەریم خۆی بەست و یەکپێ بەرەو ماڵی ستی هات، ئەوە یەکەم جارە بچێتە ماڵیان، دایکی ستی، گوتی:

شێرەکەم بیانگەیێ.

ستی هێندەی بڵێی یەکو دوو،ماینەشێی زین کرد و جڵەوەکەی دایە دەستی کەریم و پەنجەی بە پەنجەی کەوت، دوای دیدارەکەی ئاشیبا، ئەوە یەکەم جارە وا لێکدی نزیکببنەوە، ستی گۆتی:

ئاگات لە خۆت بێ.

دوور لە چاوی دایک، کەریم بۆ تاوێ چاوی لە چاوی بڕی، گوتی:

من هیچم بە سەر نایێ.

ماینەشێی تاودا، لە ئاقاری کانی ئەوین شەڕ گەرمە، نزیککەوتەوە، لە سەر بەرزاییەکەوە، بۆ تاوێ بەری خۆی دایە بەرەی شەڕ، پێکەوت، لە چەند قوڵەوە هێرشە و تەقە لە کوێوە بۆ کوێیە، ماینی لە بن گابەردێ بەستەوە، بە پێدزە شۆڕ بۆوە چۆمەکەی پێش خۆی، تەواوێ چۆم و چۆم هەڵکشا، لەو سەرەوە، لە سەر زگ بە گەوەکەدا هەڵگەڕا، لەوێ دوو گابەرد بە تەنیشت یەکەوە، دەتگوت کەلێنەکەی نێوانیان بۆ کەریمیان هێشتۆتەوە، لە نێوان دوو بەرد دامەزرا، هەندێ نەیارەکانی جوان لێوە دیارە، هەندێکیان دوور و هەندێکیان نزیکن، سێرەی گرت، بیریکەوتەوە، کە هەرێی بە خۆی دابووم تا بۆی بکرێ، گوللەی وی بە سەر و دڵی کەس نەکەوێ، گوللەی وی مەرگ نەهێنێ، تەنها برینی لێبکەوێتەوە.

بە فیشەکی یەکەم تفەنگچیەکی خست، تەڕدەستانە رووی خۆی وەرگێڕا، سێرەی لە تفەنگچیەکیدی گرت و هاواری لێ بەرزکردەوە.

دوژمن سەری لێشێوا، نەیدەزانی ئەو گوللانە لە کوێوە دێن، تا جێی کەریمیان دیتەوە، سێ چوار بریندارێتریان دا، ئێستا کەریم لە سێ لاوە و لە شەش حەفت تفەنگەوە تەقەی لە سەرە، بەڵام گوێی لێ نیە، جێی قایمە و فیشەکیش بە فیڕۆ نادات، دەنگێک لەو سەر، لە قەدپاڵەوە:

قوربانی دەست و تفەنگت بم، کەریم، دەستیان لێ مەپارێزە.

زۆری نەبرد، هێرشبەران، بە بریندارەکانیانەوە کەوتنە پاشەکشە، لەو کاتە کەریم ئەگەر مەبەستی با، دەیتوانی هەندێکیترشیان لێ بخات.

بەرەی ئاغا کە یازدە تفەنگچی بوون، سێ بریندداریان هەبوو، برینەکەی ئاغا سووک بوو، بابی ستی دەستی لە ملی کەریم کرد:

بە هیچ لە چاکەت دەرناچم، مەگەر بتکوژم!

ئاغا ماچی کرد و گوتی:

تۆ نەبایت، ئێمە تیاچووبووین، لە ناو گۆڕیش ئەو نەبەردیەی تۆ، لە یاد ناکەم.

ئیدی شەڕی بناری ئاشیبا، بووە چیرۆکی بەرناگردان و بابی ستی لە هەمووان وردتر و ژنی ئاغا لە هەمووان جوانتر دەیگێڕایەوە، ستی زۆر حەزیدەکرد لە زاری کەریمەوە بیبیستێ.

## ١٧

وا گەیشتینەوە بەهار، خانووەکانی ئاوایی، لە دوورەوە، لە بناری چیاوە دەڵێی چەند پنتێکی لە شێوەی دەنکە گەنمن بە سەر سوخمەیەکی عەرد کەسکەوە، چیا لە هەزار جۆگەلەی باریک و ئاسکەوە ئاو دەڕژێنێتە پێدەشتەوە، تازە باران لێیکردۆتەوە، ئاسمان روون روون، گەردێک لە سەر رووی ستی ببینیەوە بە بەری ئاسمانەوە نایبینی، خۆر دەرکەوت، بەڵام درەنگ کەوت، بە دڵۆپە باران رانەگەیشت تا پەلکە زێڕینەیێ بە رووی ئەو دوو ئەویندارەدا بنەخشێنێ.

لە نزیک کانی ئەوین، کەریم و ستی لە سەر بەردە تاتێ، لە تەنیشت یەک لە سەر چیچکان دانیشتوون، لە دوای ژوانەکەی سەری ئاشیبا، ئەوەی ماچی یەکەمی گرت و تامەکەی تا هەوکە لە زاریانە، ئەوە یەکەم ژوانە، ماینەشێش لە سەر بەرزاییەک نۆبەتدارە.

کەریم ساقۆکەی داکەند و رایخست، ستی دەستی خستە سەر چۆکی کەریم، کەریمیش دەستی چەپی لە سەر دەستی وی دانا و دەستی راستیشی لە سەر شانی، ستی دەڵێ:

دەی شەڕەکەم بۆ بگێڕەوە، کوا کامە بەردت کردە سەنگەر؟

ئاماژەی بۆ بەرزاییەک کرد:

هۆ وەتە، لەوێم بەڵام تۆ واز لە شەڕ بهێنە، مـن حەزم لە باسـی شەڕ نیە.

ستی دەستەکەیتری دەخاتە سەر دەستی کەریم و دەڵێ:

شەڕ دەکەیت و خوێن دەڕێژیت و حەز لە گێڕانەوەشی ناکەیت!

کەریم توند شانی گوشی:

ناچاری نەبێ، بۆ راوە بەرازیش تفەنگ هەڵناگرم.

ستی خۆی پێوە نووساند، کەریم تونـد گوشـی و کەوتـنە مـاچی قووڵەوە.

ماینەشێ بە حیلەیـێ بە ئاگـای هێنـانەوە و تێیگەیانـدن درەنـگ کەوتوون، کەریم هەناسەیەکی هەڵکێشا:

- ئێ، چارە؟

+ چارە هەر ئەوەیە، بێیە داخوازیم، هەرچەند سەر لە شاخ دانە، بەڵام هەر دەبێ وابێ.

- وایە، کژیەتی، وا دەکەم.

+ دایکت بنێرە لای دایکم با جارێ ئەوان بزانن، دوایی...

- سبەی دەینێرم.

+ تۆ دەبێ زۆر ئاگات لە خۆت بێ، ئاغا....

+ چاکەم بە سەریەوە هەبووە و منیی زۆر خۆشدەوێ، ئەگەر بشزانێتەوە، باوەڕ ناکەم....

- کە من بێمە گۆڕێ، کەس ناناسێت، دەست لە بابی خۆشی ناپارێزێت.

+ تۆ خەمی منت نەبێ.

ستی سواری ماینەشێ بوو، گوتی:

چەند خۆش بوو، ئێستا بە جووتە، بچووباینەوە ئاوایی...

کەریم:

ڕۆژێ دێ...

ستی:

لە ڕێ خۆش بڕۆ، با شەوت بە سەردا نەیەت.

***

کچێ، ئەوە چت گۆ؟! بڵێوە، بڵێوە! نا، نە من گوێم لێبووە، نە تۆش قسەی وات لە زار دەرچووە. زارت داخە و بیبڕەوە، بەردێکی وای لە سەر دانێ هەڵنەگیرێ، وس وس، نە تۆ کوڕت هەیە و نە من کچ، بابان وێران، دیارە بە خۆ و کوڕەوە لە گوێی گا نووستوون، نازانن کچی من بۆ ئاغایە، چما هەر کەسێ، بە لایدا بچێ، بە دوو فیشەکان سەری هەڵناگرێ، ئەمن بۆ تۆمە ئەگەر لە

خەمی کورەکەتی ئەگەر دەتەوێ مەرگی نەبینی، ئەو قسەی من بیستم، کەس نەیبیستێتەوە، لە بیری خۆت ببەوە، بە کوڕەکەشت بڵێ، خەیاڵی وا لە سەری دەرکات، چ زۆر کچ زۆرە، لە خوا بە زیاد بێت، قیت و قۆزە، دەست لە سەر هەر کچێ دانێ...

زاری بەش بۆوە، ورتەی لێوە نەهات، هەستاوە و بێ ماڵاوایی هاتە دەرێ و لۆژە لۆژە رێی ماڵێی گرت، بە گریانەوە ورد و باریک قسەکانی دایکی ستی بۆ کوڕەکەی گێڕایەوە و گوتی:

+ کوڕم، نەمگوت، سەر لە شاخ دانە.

- ئەدی منیش نەمگوت، چاوەڕێی ئەو وەڵامە بکە.

+ ئەدی چ رەوای خودایە، وا لە من و خۆت دەکەیت؟

- دایە، هەر دەبێ وابێ، تۆ خەم مەخۆ، لەبیری خۆتی ببەوە.

❊❊❊

دایکی ستی درەنگتر تێگەیی لە دڵی کچەکەی چ ئەوینێ هەیە، چ ئاگرێ هەیە، ئەو رۆژە بوو ئاغا بە پێی نەریت، داخوازیی ستی لە بابی ستی کرد، لە خۆشیان باڵیان گرتبوو، ئاغا دەبێتە زاوایان، ئاخر تا هەینێ رووینەدابوو، لەو دەورووبەرە، ئاغا کچە کرمانج بخوازێ، ژن و ژنخوازی تەنها لە نێوان خۆیان بوو، زۆر دوور رۆیشتبا، دەگەیشتە ناو شێخان، لە نێوان ئاغاو شێخان، ژنخوازی هەبوو، بەڵام لەگەڵ کرمانجان نا.

داک و باب چەند ڕۆژ و شەو قسەیان بۆ کرد، ستی وەک بڵێی هەر گوێی لێیان نیە، قسەی خۆش کەڵکی نەبوو، باب هەڵچوو، شەوێک:

کچە تیو، بە خۆشی نا، بە ناخۆشی، بە دەست و پێ بەستراوی، دەتبەمە ماڵی ئاغا.

ستی:

لە دەستتدێ، بەڵام بە دەستی خۆم ئاغاکەت دەخنکێنم.

باب تفەنگی لێ ڕاکێشا، دایک کەوتە سەر دەست و پێی و پیاوەکەی ساردکردەوە.

ئاغا، بەوەی زانی، بابی ستی گازکرد:

لەگەڵ کچەکەت نەرم بە، من پەلەم نیە، ئەو ساڵ نا سێ ساڵیتر، ناچار دەبێ و دێتە ڕایێ، بەڵام ئاگادار بە کەس بە لایدا نەیەت.

بابی ستی:

ئاغام، خەمی ئەوەت نەبێ.

دایکی ستی لە زاری پیاوەکەیەوە، قسەی ئاغای گەیاندەوە کچەکەی، ستی بەوە ئاهێکی هاتەوە بەر، دایکی گوتی:

کچم، بە من بڵێ، تۆ هیچت لەگەڵ ئەو کوڕەی زرێخ هەیە.

ستی لە سەرەخۆ:

مەبەستت کەریمە؟

دایک:

لەو زیاتر کێیە!

ستی زۆر بێباکانە:

ئا، زۆر شتم لەگەڵ ئەو هەیە، برۆ بە بابم و ئاغاکەتان بڵێ.

دایکی لە ئامێزی گرت دەستی لە ناو پرچی گێڕا و هۆن هۆن فرمێسکی بە سەردا باراند.

***

گەیشتینەوە رەزبەر، لە بەری ئاواییەوە بەین نا بەینێ گێژەلووکەیێ هەڵدەکات و ئاوایی لە پووش و پەڵاش دەگرێ، لەو پایزەوە کانی ئەوین کە دوو سێ دێمکە ئاوی تێدایە، لە بن سێ چوار پەلە هەوری سپی، کە یەکیان لە رەنگ و شێوە زۆر لەماینەشێ دەچێ، ستی و کەریمی بە یەک گەیاندەوە، لە پاڵ بنە درەختێکی کورتیلەی رووتبۆوە، دەڵێی کۆترن شان بە شانەوە، سەریان بە یەکتر کردووە، ماینەشێش لە سەر بەرزاییەکە رێوانە و چاو بە چواردەوردا دەگێڕێ، هێند نەرم و لە سەرەخۆ دەدوێن، بایەکەش، ئەو بایەی نەرم هەڵیکردووە و دەدا لە کەزی ستی، وشەیەک لێیان نابیستێ.

ستی که هەر ئەوەتا هەناسەی لە بەر ماوە کەمێ دەنگ هەڵدەبڕێ:

ئەوە مەکە، تووشی بەڵایەکت دەکەن، نا ئەوە نابێت.

کەریم ماچێکی سەری کوڵمی دەکات و دەڵێ:

ناچارین، هەر ئەو رێیە هەیە، وا دەکەین، بۆوەی قسەی ئەوم نەیەتە سەر، رەنگە دوایی بڵێ...

ستی:

کەریم، مەکە، دەتکوژن، بە خودای دەتکوژن.

کەریم:

مەترسە، نامکوژن، ئاغا جارێ کاری پێمە.

هێشتا مابووی ماینەشێ بحیلێنێ، گەیشتە سەر زینێ:

با، قسەی تۆ بێ، زۆر هاییت لە خۆ بێ.

***

تۆ نەبای، دەرمەدەکردی، دەستی ردێنە سپیەکەتم شکاوە، پێیبڵێ ئەو جارە لێیخۆش دەبم، چوونکە چاکەی بە سەرمەوەیە و لەمردن دەربازی کردووم، بەڵام جارێکیدی هەڵەی وا بکات، لە سەری ناچێ، بۆچی تۆ نازانی؟ ئەو نازانێ، من یەک کچم هەیە،

ئەویش بۆ ئاغایە، ئەگەر دوو کچم هەبا، ئەویدیانم دەدا ئەو، بڕۆوە پێیبڵێ:

من چ کچم نیە.

پیرەمێرد بە کۆخە کۆخ گەیشتەوە سەر دەرگای ماڵی کەریم، بەر لەوەی زار هەڵێنێ، کەریم گوتی:

دەزانم، مەیگێڕەوە، لێم خۆشبە کە ماندووم کردی.

پیرەمێرد:

ئەو پیاوە پێناچێ لە تیرەی بنیادەم بێ، بە راستی خوبزەیەکی پیسی ئاغایە، حەیف ئەو کچە لەوە!

***

کەس نەیزانی لە زاری کێوە، ئەو چوونە داخوازیە چۆن گەیشتەوە ئاغا، گازی کەریمی کرد، لە دیوەخانێ دوو بە دوو دانیشتن، لە سبیانێ زوو تا بەرە بەری نیوەڕۆیێ لە ژۆرێ مانەوە، کەمێکی نەبێ، بەشی زۆری قسە و باسی ئەو دانیشتنە تا هەوکەش بە نهێنی ماونەتەوە، هێندە نەبێ ئاغاژن بە خۆگرتن لە پەنای دەرگاوە، بیستبووی و رۆژی دوایی بۆ ستی گێڕابۆوە:

ئاغا:

کەریم، نەدەبوو ئەوە لەگەڵ من بکەیت، ئەگەر نەتزانیبا من بۆ خۆمم داناوە.

کەریم:

ئاغا، من بیستم هی ئێوە سەری نەگرت، بۆیە چووم، دەنا هەڵەی وا چۆن دەکەم.

ئاغا:

من کە شتێکم ویست، دەبێت سەربگرێ، ئەورۆ نا، سبەی.

کەریم:

ئاغا:

تۆ هیچت، لەگەڵ ئەو کچە هەیە؟ لە نزیکەوە....

کەریم:

نەخێر، تەنها لە سەر مایینەشێوە دەیبینم، یەک جار نەبێ، ئەو جارەی بە هانای ئێوەوە هاتم، چوومە ماڵیان و مایینەکەم لێوەرگرت.

ئاغا:

کەریم من لە چاکەی تۆ دەر ناچم، بەڵام ئەوە نابێ، لە خەیاڵی خۆتی دەرکە.

کەریم:

ئاغا:

بە خۆت دەزانی بەرەبابی مە، هەرگیز ژنیان نەداوەتە کرمانج، من ئەو نەریتە دەشکێنم و کچی خۆمت دەدەمێ.

کەریم:

ها .......................

ئاغاژن کاتێ گازی ستی کرد و دوو بە دوو دانیشتن و دانیشتنەکەی دیوەخانێی بۆ گێڕایەوە، گوتی:

کچێ، لە چاوترا دیارە کوشتەی ئەو کوڕە قۆزەی، دەزانی کێت هەڵبژاردووە، بە خودای کچی منی بوێ، بە گەڵی دەدەدم، کچێ نەکەی لە دەستی خۆتی بدەی، کچێ نەکەی بە بەر چاوی خۆتەوە، ئاغا خوێنی لە کاسە بکات، دەیکوژێ بە خودای دەیکوژێ...

ستی دەڵێ:

نا، خۆ من هیچم لەگەڵ ئەو کوڕە نیە.

درۆ مەکە، چاوپـــان، دەزانـــم ئـــاگرت بـــۆی گرتـــووە، لە منـــی مەشارەوە، هەرێت پێنەدابێ، دێتە داخوازیت؟

کا، تەماشای ناو چاوم بکە.

ستی تەماشای دەکات، ئاغاژن دەڵێ:

نەمگـــوت! ئەوەتـــا وا لە نـــاو چـــاوتە، لە نـــاو چـــاوی خـــۆت هەڵتگرتووە، ئەویش تۆی لە ناو چاوی خۆی پاراستووە، ئەو کـوڕە بـــوێر و قـــۆزە، لە دەســـــت خـــۆت نەدەی، کـــێ کـــوڕی وای دەستدەکەوێ؟ خودا لە سەر سەرانە وەک بۆ تۆ ئاگری گرتووە، بۆ من بیگرێ، بەگەڵـی دەکەوم و ئاغا بە مـاڵ و منـداڵەوە، بە مەڕ و ماڵاتەوە بۆ تۆ بەجێدەهێلم.

گوێبگرە کچێ، لە منی وەرگرە، ئاغا بشـتخوازێ، تەنهـا، چەنـد مانگێکە، دەتکاتەوە، کارەکەرەکەی جـاران، کیـژێ تێبگە، کرمـانج نابنە ئاغاژن.

ستی:

ئەوە دەزانم.

ئاغاژن:

ئێ، کە دەزانی دەبێت تا زووە، چارەیەک لە خۆتان بـکەن، بـڕۆ هەرێی پێبدە کە بەگەڵی دەکەوی، سەری خۆتان هەڵگرن، من بایی حەفت ساڵ زێڕ و پارەتان دەدەمێ.

لە شـەو و ڕۆژێکـدا ئەوینـی کەریـم و سـتی کەوتە سـەر زاری ئاوایی، بەو هەور و بارانە، پەرپەوە، پێدەشـت پێدەشـت، ڕۆیـی، بە چیادا هەڵگەڕا و ئاودیو بوو.

شەوێکی ترسناکە ئەوشۆ، شتێ دەقەومێ!

## ١٨

زەوی قــــوڕ و لیــــتە، ئاســــمان هەور و لـــێڵە، شـــەوێکی ئەنگوستەچاوە، بایەکی سارد، دەڵێی لە بەفرەوە هەڵیکردووە، چاو چاو نـابینێ، بەڵام مایندەشـێ ڕێ دەبینێـتەوە و دەزانـێ، نەرم نەرم پێی دادەنێ، بە شێوەیێ دەڕوات، تا لە ئاوایی دەرچـوو، چ سـەگێ هەستی پێنەکرد و حەپەیێ لە هیچ لاوە نەهـات، بە دوو سـوارەوە، لە بستیایی لای گۆڕستانەکە و رووە و ڕۆژاوا، ڕووەو چیا، لێژبۆوە، لە خـوارێ، تەواوێ بە ڕێـی خۆیـدا گەڕایەوە، لە گەڕانەوە، دەسـتی راسـتی گـرت و بە دەوری گونـدا سـوڕایەوە، تـا لە پشـت گونـدەوە هاتەوە سەر راستەڕێ، چەند جارێ ئەو پێچ و دەورەی کرد.

+ بۆ شوێنبزرکردن وات کرد؟

- ئـا، کەمـێ دوادەکەون و درەنـگ بە ڕێـی ئـێمە دەکەونەوە، تـا دەگەینێ، دەبـێ زۆر ڕێ بگـۆڕین، وەهـا سـەریان لێبشـێوێ، عەلـی شوونهەڵگریش شوێنپێی مایندەشێ نەبینێتەوە.

+ دەڵێێ چی شتێ لە سمی بکەین، بۆوەی هەر نەیبیننەوە.

- ئەگەر پێویستی کرد، وا دەکەین.

+ بەوەی باشە، رەنگە سبەیش کەس نەزانێ.

- بابت کەی دێتەوە؟

+ لەوانەیە دوو سبەی، دایکیشم....

دنیا تاریکە، بەوەی باشە، ڕێگا راستانە و ماینەشێ کێشەی ڕۆیشتنی نایەتە پێشێ، سووی زۆر ساردە، ستی توند ناوقەدی کەریمی گرتووە، تفەنگەکەی لە نێوان زگی خۆی و پشتی ئەو درێژ کردووە و قایشەکەی بە ملی خۆیەوە کردووە، ڕوومەتی بە ناو شانیەوە نووساندووە، بیری لای دایکیەتی و لە بەر خۆیەوە دوا رستەکانی وی دەڵێتەوە:

کچم، ئەوە بزانە، من لە هەموو دنیایێ تاکە داکم کە کچی خۆی بەو شێوە بەڕێکردبێ، هیچ دایکێک ئەوەی نەکردووە، من دەیکەم، یەک ڕۆژ خۆشیی تۆ، بە خۆم و هەموو دنیا ناگۆڕمەوە، بڕۆ، دەزانم زەحمەتە بتبینمەوە، بەڵام لە هەر شوێنێک گیرسانەوە، کەسێکی بە متمانە ببینەوە و بینێرە، خەمی منت نەبێت، هیچم بە سەر نایەت، تۆ لە هەر شوێنێک بژیت، با هەناسەی تۆم بۆ دێنێ و بە هەناسەی تۆ دەژیم...

شەوە دیار نیە، دەنا ساقۆکەی کەریم تەڕبووە لە فرمێسکی ستی.

کەریم، دەستێکی گەیاندە سەر دەستەکانی ستی و دەڵێ:

توند خۆت بگرە.

ستی دێتەوە سەرخۆ و هەوڵدەدات دەنگی گریانی پێوە دیار نەبێت:

بازۆ، من ناکەوم.

کەریم هەستدەکات پڕ چاوی فرمێسک و پڕ قورگی گریانە:

کیژێ، ئەوە چیە، بگەڕێینەوە؟!

ستی پێکەنینێکی ناسکی بۆ دەکات:

بازۆ، ئەوە گریانی خۆشیە.

- زانیت دەچینە کوێ، وا نیە؟

+ماڵی شێخ، ئەرێ کێ بوو؟

- شێخی هەوێنە، ناودارە و کەس لە قسەی دەرناچی.

بەو شـەوە تووشـە ماینەشـێ، دوو ئەوینـداری سـەرهەڵگرتووی هەڵگرتووە و تاریکی دەبڕێ، ماینەشێ دوو چاوی پێوە لە ئەستێرە دەچن و ڕێی خۆی ڕووناکدەکاتەوە، لە ڕەوهانیی خۆی نـاکەوێ، لە جێ جێ نەبێ، بە چوار پەلە ڕێ دەبڕێ، وەک بڵێی بزانێ، ترسێک لە دواوەیە و لە سەریەتی زوو بگاتە جێ.

ساردە و تا دێ ساردتر دادێ، ستی دەڵێ:

کەریم، باران دادەکات یان نا؟

کەریم سەرهەڵدەبڕێ:

تاریکە، دیارنیە، هەورەکەی بارانیە یان نا، بەڵام وا تێبگەم ئەو یەک دوو ڕۆژە، ئاسمان باراناوی دەبێت.

ستی:

تۆ کوو دەزانی، دەبارێ یان نابارێ؟

کەریم:

کەمێکی لێدەزانم، فێربوونی ئەوە هەندێک زەحمەتە، بە من بڵێ، خۆ تفەنگ و نیشانەت لەبیرنەچۆتەوە؟

ستی:

دەڵێی هەستتکردووە تووشی شەڕ دەبین؟

کەریم:

نا، بەڵام ئەوە دنیایە...

ستی:

خەمت نەبێ، دەرزی نا، بەڵام سەری کەپووی ئاغات لۆ هەڵدەگرم.

ڕێوبان کەمێک ڕووناکایی تێکەوت، ماینەشێ دەڵێی تیرە لە کەوان دەرچووە، شەو چوو، بەڵام هەور و لێڵێکە ڕۆژیش درێژکراوەی شەوە، ستی دەڵێ:

+ دەزانی، ژنی ئاغا مستێ پارە و زێڕی دامێ.

- وەرتگرت؟

+ ئا.

- نەدەبوو وەریگریت.

+ بەزۆر دایمێ، نەدەبوو وەریگرم؟! ها! قسەی تۆیە، نەدەبوو...

- تازە وەرتگرت و چوو، بیری لێمەکەوە.

+ ئا، خۆ ئەوانیش ئارەقەیان بۆ نەکردووە، هەموو هی ئەم و ئەوە، زێڕ و زیوی وان هی پووشانە و سەرانەیە.

- وایە، کچێ تۆ هەر لە جوانی نا، لە ژیریش بێ هاوتای.

+ ئەدی خۆت لۆ نالێی؟!

توندتر خۆی پێوە نووساند، دنیا رەش داگەڕا، دایکردە باران، کەریم گوتی:

ئەوە ئاوایی، ئەو تاریکی و بارانە بۆ ئێمە باشە، دوور لە چاوان خۆ بە ماڵی شێخدا دادەکەین.

## ١٩

بنووســه، داســتاننووس بنووســه، هــیچ مەپەڕێــنە، هــاریوونی بەرازەکەی ئەو ئێوارەیە وەک خۆی بنووسەوە:

ئاگری لە چاو دەباری، لە سەر دەرگاوە:

ئەوەی بیستم، راستە؟! ستی کوا؟ کێوە چوو؟

بە گریانەوە، گوتم:

هەر هێندەی تۆی لێدەزانم.

قۆنداخە تفەنگێکی لە شانم دا، ئاگر لە چاوم دەرپەڕی:

درۆ دەکەیت، دەزانیـت، تـۆ دەبێـت لە پـێش ئەوان بمریـت، هەر هێندەم بیست، نازانم چەندی گوت و چەندی کوتـام، کـاتێ وەئاگـا هاتمەوە، بە شەلەشەل چوومە دەرێ.

داستاننووس جارێ لەو گەڕێ، وەرە هی من بنووسەوە:

بـابی سـتی لـێم وەژۆرێ کەوت، پیلـی گـرتم بە دیـواری دادام و گوتی:

کـوڕە خـوێڕیەکەت بـۆ کـوێ نـارد؟ زوو بڵـێ تـا زارم پـڕ گـولله نەکردووی.

لێی نەترسام و هاوارم بە سەریدا کرد:

هێی پیاو! شەڕی تۆ لەگەڵ کێیە؟ شەرم لە خۆت ناکەیت بە گژ مندا دێیت؟ ئەگەر وا ئازایت، برۆ رووبەڕوو بە کەریم بڵێ خوێڕی، من چسوانم، تۆ چەند دەزانی من هەر هێندە، چسوانم کوڕەکەم لە کوێیە.

دەستی بەرزکردەوە لێمبدات، گوێم لە ئاغا بوو لە دەرێوە:

واز لەو ژنە بهێنە، شەڕی ئێمە لێرە نیە.

هەر بە راستیش نەمزانی سەری خۆیان بۆ کوێ هەڵگرت، سەر لە ئێوارەکەی گوتی:

دایە، هەرێ وایە، ئەوشۆ بڕۆین، خەمت نەبێ، زۆر نابات، لە شوێنێ دەگیرسێمەوە، هەینێش وا دەکەم تۆ بگەیتە لام، مەشترسێ، ئاغا هێندە ناپیاو نیە کە شتێکت لێبکات.

نەنە زرێخ دەستی بە گریان کرد، ژنەی خەوناوی هەڵیدایێ:

مەگری، کچێ مەگری، گریان تەواو، دەی داستاننووسەکەم، هی من بنووسەوە، تەواوم نەکرد:

دوایوەی بە هۆش هاتمەوە، بە شەلەشەل رۆیشتم، نەمدەزانی بۆ کوێ، خۆم لە حەوشەیماڵی ئاغا دیتەوە، هەرابوو لەوێ، بیست سی تفەنگچی دەست لە سەر تفەنگ راوەستاون، گوێم لێیە، بەرازەکە دەڵێ:

ئاغا، من بە دەستی خۆم کچەکەم دەکوژم، کوڕەکەش بە تۆ دەسپێرم.

ئاغا دەڵێ:

نا، تۆ کەریم دەکوژی و منیش ستی.

بیرم لەو قسەیە کردەوە، لە دڵێ خۆ گوتم:

تۆ بڵێی هێشتا بە تەمای ستی بێت و دڵی نەیەت بیکوژێت؟

کەمەک باوەڕم بەو لێکدانەوەی خۆم هێنا و ئاهێکم هاتەوە بەر، گوێم لێیە ئاغا دەڵێ:

جاڕچی، برۆ جاڕدە، ئاوایی ئاوایی، تا دەگاتە شار، هەر کەسێ کەریم و ستی ڕاگرێ، ئەوا شەڕی لەگەڵ ئاغا ڕاگەیاندووە، هەر مەلایێ لێکیان مارە بکات، بە قورئانەوە لە خوێنی دەگەوزێنم.

ئاغا هاوار دەکات:

نابێت، وا نابێت، شوانەوێرەیەک ستی ببات!

داستاننووس ئەوەش بنووسە:

دوو ڕۆژ ڕۆیشتبوو، سەری سێیەی، ئاغاژن بە پێکەنینەوە هاتە ماڵێ، گوتی:

مـزگێنیم بـدێ، شـێخی هەوێـنە هەواڵـی نـاردووە کە پێویسـتە مەسرەتی بکەین و خوێن نەڕژێ.

نەمزانی نە بگرییێم نە پێبکەنم، ئاخر...

داستاننووس، منیش شتێکم لە بیرچوو:

دوای دوو سـێ ڕۆژێـک، ئاغـاژن بە دوو تـوورەگە دانەوێـڵەوە بە ژۆرێ کەت، لە خۆشیان زاری نەدەگەیشتەوە یەک، گوتی:

ئاغا منـی نـاردووە کە پێـت بڵـێم، تـۆ هەر لە شـوێنی خـۆتی و کەس بۆی نیە بڵێ لە سەر چـاوت دوو بـرۆیە، نـاهێلم لە هیچیشـی کەم بێت.

منـیش کە بیسـتم لە مـاڵی شـێخی هەوێـنەن، ترسـم کەمەک ڕەویەوە.

## ٢٠

عەسرانێکی درەنگە، ئاسمان دەپرووشێنێ، کەریم و سێ چوار پیاو روو لە دەرگا دانیشتوون، گوێیان لە شێخ راگرتووە، باسی دنیا و پەسڵانیان بۆ دەکات، لەپڕ کوڕێژگەیێ بە هەڵەداوان خۆی بە ژۆرێدا دەکات و دەچێتە بن گوێی شێخ و دەکەونە فسکە فسک، کەس تێناگات چ باسە، شێخ رەنگی دەپەڕێ، کەریم دڵی هەزارە دەکات.

دوای کەمێک، شێخ روو دەکاتە کەریم:

من نەمزانی وای لێدێت، ئەوانە وا دیارە کەس بە پیاو دانانێن، بایی پووشکەیێ بەهایان بۆ شێخاتی من تێدا نەهێشتەوە، ئاغا وا بە بیست سی چەکدارەوە بەرەو ئاوایی دێ، ئەو شێوە هاتنە بۆ شەڕە.

کەریم پڕدەداتە تفەنگەکەی:

ستیم بۆ گازکەن، ماینەکە...

ستی لە دیوی ژنانەوە بە بوخچەوە دەردەپەڕێ، لە چاو ترووکانێ، ماینەشێ زین دەکرێ، کچی شێخ لە بای غارێ چەند نووردووە نانێ دەداتە دەستی ستی، شێخ بە هەوکی پڕ گریانەوە روو لە کەریم و ستی:

لە سەر ئەوەی نەمتوانی پەنای ئێوە بدەم، چاوم بە بەهەشت ناکەوێ.

ستی دەڵێ:

مەترسێ، من نزا دەکەم بچیە بەهەشتێ.

لە شێوەی پەلیک دەردەچن.

لە پەڕگەی ئاوایی، سوارەکان گەیشتن، کەریم ماینی ڕاگرت، ستی:

ئەوە چیە! خۆ رادەست دەکەیت؟

کەریم چ قسانی نەکرد، لە چاوترووکانی، هەر لە سەر ماینەوە، جێی خۆی گۆڕی و پشتی بە پشتی ستی دا و گوتی:

لە تۆ فڕین، لە من شەڕ.

ستی ماینی تاودا و گوتی:

بتبینم و نەتناسم.

کەریم:

من نامەوێ خوێن بڕژێ و کێشەکە ئاڵۆزتر بێت.

ماینەشێ فڕی، لە بیست و یەک تفەنگەوە گوللە دێ، کەریم دەڵێ:

لە بستیەکە ئاودیو بوویت، ڕێی ڕۆژاوا بگرە.

ستی دەڵێ:

کەریم، دەنگی تفەنگت نایێ، بمزانیبا وای، جێی خۆمم نەدەدایێ.

کەریم دەڵێ:

بە ماینەشێ بڵێ، باشتر بفڕێ، مەترسە، دوورن.

ماین پێێ بە زەویەوە نەما، ڕاست و ڕاست نا، پێچاوپێچ دەکات، خۆ بڵند و نەوی دەکات، خۆ لە بەر گوللە لادەدات، ئەو لادانە هەر لە خۆی دەهات، کلکی لە ئاسمانێ ڕاگرتووە، وەک بڵێی کردبێتیە سپێر، ئەگەر گوللەیێ بۆ سینگی کەریم بێت، ئەو بیگێڕێتەوە.

ستی گوێی لە گیزەی گوللەیە، بە سەر کەریمدا هاواردەکات، بتەقێنە وێت دەکەوێ، دەنا ڕووی ماینەشێ وەردەسووڕێنم با بە سینگی من بکەوێ، چەکەکەم وێدە...

کەریم دەڵێ:

شتی وا نەکەیت، ها...

فیشەکێ دەتەقێنێ، دەڵێ:

دڵ لە دڵ مەدە چاریان دەکەم.

کەریم دەبینێ ئاغا لە پێش هەموو سوارەکانەوە خەریکە تەواو نزیک بێتەوە، چارەی نەکات، چارەی دەکات، دەڵێتە ستی:

جڵەوی ماینەشێ کەمێ توند بکە و بۆ منی لێگەڕێ.

سێرەی لێگرت، کوێی ویست، بە موو سەر و خواری نەکرد، ئەسپ وەک فرفرۆکە بە دەوری خۆیدا سوورِا و سوار کەوت.

- ئەوهات لێدەکەم.

+ دەڵێی یەکێکت کوشت!

- نا، بەڵام، تەختی نێوچەوانی سەگلاوییی ئاغام سمی، ئەوەتا بە ئاغاوە، لەو گۆڕە کەوتوون.

+ خۆزی لە نێوچەوانی ئاغات دەدا

- گوتم، ناخوازم کێشەکە ئاڵۆزتر بێ.

+ هەر بە دوامانەوەن؟

- نا، وا بە دەوری ئاغاوەن، نایەن، ئەورِۆ بە دوامانەوە نایەن.

+ ئێستا بەرەو کوێ؟

- ئەو رێیە، بەر مەدە، شەو خۆ بە ئاواییەکدا دەکەین، مەترسە، جێمان هەیە، بەڵام بوەستە، با بێمەوە جێی خۆم.

+ ئەو جارە، تووشی شەڕیش بین، جێی خۆمت نادەمێ، شەڕی من ببینە.

هەور هەڵیپرینگاندووە، ڕۆژ لە سەر ئاوابوونە، دابەزین، بە دیارە زەردەپەڕەوە، ئامێزیان بە یەکتردا کرد، ماینەشێش تەماشای دەکردن کلکی بادەدا.

+ مەلای ئەو ئاواییە دەناسم، ئەوشۆ مارەت دەکەم، دەڵێی چی؟

- دەڵێم مامۆستا، بە ڕەزامەندیی خۆم و دایکم، لەو کوڕەم مارە بکە، بابیشم با هەر لە گوپی خۆی بدات.

توندتر، یەکتریان گوشی و سواربوونەوە.

دوای ماڵنووستنان گەیشتنە ئاوایی و خۆیان بە ماڵێکدا کرد، بەڵام سەگەل هەواڵی هاتنی مێوانێکیان دایە ئاوایی، ئەوانەی خەویان سووک بوو، هەستیانکرد شتێ هاتۆتە ناو ئاوایی، خانەخوێ وەک چاوەڕێی هاتنیان بێت، سەری سوڕنەما، بە بێدەنگی هەوساری ماینەکەی لێوەرگرتن، ماین غەزری و نەچووە دووی، ستی دەستی بە بژی داهێنا و شتێکی لە بن گوێی خوێند، ماین بووە ماستی مەییو، زۆری نەبرد، سووکە خواردنێ پێکەیی:

+ منیش پێش پێی ئێوە گەیشتمەوە ماڵێ، دڵم تریواندی ئێوە دێن.

- چ دڵێکت هەیە!

بەر لە ماڵنووستنان، لەو ئاواییەی سەرێ، هەواڵی کوشتنی ئەسپی ئاغام بیست.

+ چ زوو!

- هەواڵی ئێوە با دەیهێنێ، با ئاوایی دەیگێڕێ.

+ کەواتە، با سبەی هاتنی ئێمە بۆ ئێرە بۆ ئاغاش دەبات.

- وا زووش نا، خەمت نەبێت، وەها دەتانشارمەوە، با نەتانبینێتەوە.

+ تۆ وابکە، مەلا ببینین.

- پەلە مەکە، سبەی شەوێ دەیهێنم، ئەگەر بوێرێ.

+ بۆ ناوێرێ؟

نەتبیستووە، ئاغا هەڕەشەی لە مەلایان کردووە و گوتوویەتی هەر مەلایێ...

- ئەوها! با من بیبینم، بزانم.

+ سبەی دەچم، ئێستا بخەون.

ماڵی خانەخوێ، دوو دیو بوو لە ناویەک، ستی چووە دیوی ژنان.

سبەی زوو، خانەخوێ، کچە پارچەڵەکەی گازکرد و بابەتەکەی تێگەیاند و گوتی:

تۆ ئەورۆ لە ناو گوند دەگەڕێی، دەبیە سەیار، لە هەر رێیەکەوە کەسێکت دیت دێتە ئاوایی، کێیە، دەچێتە کوێ، ئاگادارمان بکەوە، خۆت بگرە، گوێڕادێرە، بزانە خەڵک باسی چی دەکەن، ئەوەی گوتم لەبیرینەکەی.

کچە (بەڵێ، بەڵێ)ی کرد و چووە تەنیشت ستی، دوو ماچی توند و بە دەنگی لە روومەتی کرد و وەک پەلیک دەرپەڕی.

ژنەکە دەستی لە ملی ستی کردووە:

شۆخەکەم، مەترسێ، لە ناو باخەڵم بتشارمەوە، دەتشارمەوە، خۆمت لە سەر دادەنێم، گیانەکەم، ئەوینی ئێوە لە هی مەم و زین پاکترە، لە هەموو جێ باس دەکرێ، مەترسێ.

ستی دەڵێ:

ئەوەی نەمبێ ترسە، شێ و تفەنگمان پێیە.

کچە پارچەلەکە بە هەڵەداوان خۆی بە ژوورێدا کرد:

+ بابە، پیاوێک هاتە ئاوایی و بەرەو ماڵی کێخوا رۆیی.

− نەتناسی؟ چەکی پێبوو؟

+ نا

- باشه، برۆ ئەو ناوە، بزانە چ دەبێ و چ دەبیستی، بەڵام لە هاتن و چوونێ، بزانە چۆن دەڕۆی، کەس هەست بە شتێک نەکات.

کچە پێکەنینێکی بۆ کەریم کرد و دیسان ستی دایەوە بەر ماچان.

کەریم دەڵێ:

ئێمە هەر ئەوشۆ لێرە دەمێنینەوە، مەلا بێت و...

خانەخوێ:

شتی وا نیە،ماڵی خۆتە، ناچیە هیچ کوێ.

کچە بە ڕەنگی پەڕیوەوە خۆی بە ژوورێدا کردەوە، هەناسەی سوار بووبوو، قسە نەدەهاتە دەرێ:

+ بڵێ، کچم چ بووە؟

بابە...مام...کێخوا دەڵێ، وا دێ، ماڵ ماڵ، لە تەویلان دەگەڕێ، دەڵێ: ئەسپەک دزرایە...

کەریم دەڵێتە ستی:

خۆ خڕکەوە.

ستی کەمێک دادەمێنێ:

ئەگەر کێشــە تەنهــا تەویـلە و بە دوای مــاین گەڕانـدا بــێ، مــن چارەی دەکەم...

خانە خوێ و کەریم پێکەوە:

کوو کوویی!

ستی دەڵێتە کەریم:

زوو ماینەکە بێنە و هەموو لێم دوورکەونەوە.

ماینی راکێشایە دیوی ژنان، هەمـوو لە دیـوی پیـاوان چـاوەڕێن، دوو خولەکی نەبرد، ستی گۆتی:

تەواو.

سەریان بە ژۆری داگرت، چ ماین دیار نیە، واقیانوڕما...

دەبینن، لە تەنیشت ئەستێرکەکە، ئەستێرکێکیتر قیت بۆتـەوە و بە دوو ســێ پێخەفــان داپۆشــراوە، ئــای! ئەوە ماینەشـێیە چـۆکی داوەتەوە و وا قرم قرم جۆ دەقرمێنێ، کەریمیش تێنەگەیشت، ستی چ جادوویەکی لە ماین کردووە.

خانەخوێ گوتی:

لەو پەنایە کونێکم لێداوە، جێی ســێ چـوار کەســی لێـدەبێتەوە، شەیتانیش نایبینێتەوە، ئەگەر پێویستی کرد، ئێوەش بچنە ئەوێ.

ستی دەڵێ:

مـن نـابێ شـێ بەجێبهـێلم چـوونکە ئەگەر زۆرم پێبچـێ، گازمدەکات.

کەریم و ستی بە دیار مایندەشێوە مانەوە، لە کولانکەوە چاوەڕێی هاتنی کوێخا دەکەن.

کوێخا و پیاوێک گەیشتن:

بە راستی لە دڵم خۆش نیە سەر بە تەویلەی ئێوەدا بگرم، بەڵام ناچارم، ئەسپێک دزراوە و لە سەرمە وا بکەم.

خانەخوێ:

ئەوە شتێکی نوێیە! بەڵام فەرموو.

کوێخا پیاوەکەی ناردە ناو تەویلە، بە خۆشی چاوی گێـڕا بە بەر بێرایـــی و بە پشـــت خـــانووەکەدا ســـووڕایەوە، تەوقەی لە گەڵ خانەخوێ کرد و رۆیشتن.

ئەو رۆژە تا شەو داهـات، تـا درەنگـانی شـەو ژن و کـچە بەدیـار ستیەوە دانیشتن، ژنە ناوە ناوە دەیگۆ:

کچـێ، تـۆ چـی، ئەو هەمـوو جـوانیەت لە کـوێ هێنـاوە؟ لە چ ئاسمانێکەوە هاتووی، چ فریشتەیەکی، ئەوە کێ فێری زمانی مایندی کردی؟ زمان قەینا، بەڵام چۆن وات لێکردووە وا گوێڕایەڵ بێ؟

ستیش ناوە ناوە بزەیەکی شیرنیان بۆ دەکات:

بە خودای تۆ بە خۆت و کچەوە لە من جواترن، ئێوە جوان تەماشای خۆتان بکەن.

ژنە جاروباریش دەڵێتە کەریم:

کاکە جوانەکەم، زۆر ئاگات لەو فریشتەیە بێت، خودا فریشتەی بە تۆ داوە، وەیش! ئێوە چەند لە یەک دەوەشێنەوە، هەر ئەو شەو مەلا بێت، ئیدی دەبنە ژن و مێرد، دەک خودایە، پێکەوە پیروخەرۆ بن.

شەو درەنگە، گرمە و برووسکەیە و باران بەخوڕ دەبارێ.

خانەخوێ:

دەبێ مەلا بە شێوەیەک بێت، کەس نەیبینێ، هەر کەسێ هەست بە هاتنی بکات، هەموو شت ئاشکرا دەبێت، بەوەی باشە،ماڵیان نزیکە، وا دەچم، بزانم.

کەریم:

ئیدی ئەوە لە سەر خۆتە، هەر ناوی من بڵێ دێ، من چاکەم بە سەریەوە هەیە.

مەلا بووبووە جل، ساقۆ درێژەکەی، داکەند و خانەخوێ بە داریەوە کرد، مەلا ئامێزی لە کەریم دا و دەستی بە گریان کرد،

گریانی مەلا سەیر بوو، ئەو ساڵەی کوڕەکەشی جوانەمەرگ بوو کەس فرمێسکی بە چاویە نەدی، ئێستا ئەو گریانە بۆ؟

کەریم دەڵێ:

مامۆستا من لەو گریانەی تۆ تێناگەم.

مەلا:

کەریم، تۆ لە جێی من بیت، بە کوڵتر دەگرییێی، بە خوڕتر رۆندکان دەبارێنی.

کەریم:

گریانی ناوێ، بڵێ....

مەلا:

تۆ یەک کارت بە من کەوت، ئەوجا ناتوانم بۆت بکەم.

کەریم:

دەزانم هەڕەشەت لێکراوە، بەڵام بە نهێنی دەمێنێتەوە، ناگاتەوە ئاغا.

خانەخوێ:

مامۆستا، متمانەت بە ئێمە نیە؟ بە ژن و منداڵەوە سوێندت بۆ دەخۆین ئەو رازە لەگەڵ خۆمان ببەینە بن گڵ.

مەلا:

منیش لە سوێندەکە دەترسم.

کەریم:

مامۆستا، من لە تۆ تێناگەم.

مەلا:

من نە لەوە دەترسم لە زاری ئێوە دەربچێ، نە لە هەڕەشەی ئاغا، لە سوێند.

کەریم:

مامۆستا، سوێندی چی؟

مەلا:

ئاغا زانیبووی من زۆر برادەری تۆم، بە قورئانەکەی بەر دەستم سوێندی دام کە ئەو کچە لە تۆ مارە نەکەم، خۆزی مردنم هەڵدەبژارد، نەک سوێند.

کەریم:

ئێ، ئەوە هەر کێشە نیە، مەلایەکیدی.

مەلا:

وەک من بزانم لێرەوە ئاوایی بگەڕێی، هەردوو دیوی چیا بگەڕێی، هیچ مەلایەک ئەو کارە ناکات.

کەریم:

هەموو هەڕەشەیان لێکراوە و سوێند دراون؟

نازانم سوێند، بەڵام هەڕشەیان لێکراوە، خۆزی هی منیش هەر هەڕەشە و ئەو سوێندە دەبوو.

مەلا دەست بە گریان دەکاتەوە، کەریم بە سەرسوڕمانەوە دەپرسێ:

مەلا بۆ لەوە پتر چ هەیە؟

مەلا:

خۆزگە نەمدەزانی ئێوە لێرەن، چوونکە ناچارم زمانتان لێبدەم.

خانەخوێ خۆی لێ توورە دەکات:

مەلا، ئەوە چ دەڵێی، شێت بووی؟

کەریم دەڵێ:

لێی گەڕێ، تێیگەیشتم.

مەلا باوەش بە کەریمدا دەکات و دەڵێ خۆزگە گووم خواردبا، نەک ئەو سوێندە.

کەریم:

گریان بەسە و خەم مەخۆ، ئێمە هەر ئێستا ئێرە بەجێدەهێلین، تا پیاوی ئاغا دەبینیەوە، نازانی ئێمە لە کوێین.

مەلا بەگریانەوە رۆیی.

خانەخوێ دەڵێ:

ئەگەر رێمبدەی، ناهێلم تا سبەینێ بژی.

ستی هەڵدەداتێ:

ئێمە وا لە بەر خوێنڕشتن هەڵدێین، ئەوجا...

کەوتنە خۆ خڕکردنەوە، بایی چەند رۆژێک نان و ئالیکیان هەڵگرت، کەریم سەری نایە بن گوێی خانەخوێ:

هێندەم بۆ بکە، سبەی برۆ مەلا سلێمان ببینەوە و پێیبڵێ:

بە مابنەشێوە چاوەڕێتین.

خانەخوێ:

هەر هێندە، نەڵێم روویان لە کوێ کرد؟

کەریم:

هێندە و بەس، خۆی تێدەگات.

**بەگریانەوە بەڕێیانکردن، باران لێیکردۆتەوە، تاریکی شەو لـوولی دان.**

٢١

هاین، هاین، هاین

سەد جار لە من هاین

لە بەڵای ناگەهان لە گەفان،

لە سووندان و لە قورئان، هاین

هاین لە منی دڵ پڕ لە کول و ژان، هاین

لە ترسی وی زۆرداری وی ئاغاین

نە لە گوند نە لە شاری

چ مەلاین نەهاتە راین

تا لێکدی مارەکات کەریم و ستی

لە سەر دەستووری خۆشەویستی خوداین.

داستاننووس بنووسەوە، هەرچیم گۆت، بینووسەوە.

سوێندی مەلا و راسپاردەی کەریمم بیرکەوتەوە، بەماینەشێوە چاوەڕێمن! تێگەیشتم، سەر لە ئێوارە، دوور لە چاوان، بە هێسترە بۆزەوە بەڕێکەوتم و ئەوەی بەبیرم داهات و بە پێویستم زانی،

خستمە بارەوە، زەوی تەڕە، بەڵام هەور و باران نیە، لە بنار مانگم لێهەڵهات، بەرەبەیان گەیشتم.

ماینەشێ بە حیلەیێ لە هاتنم ئاگاداری کردنەوە، بەر لە هەر شتێ، لە بن دوو تیشە شاخ کە نیوە ئەشکەفتێکی گچکەیان پێکهێنابوو، جێیەکمان بۆ ماین چێکرد، لە پێشەوە هیشکە کەڵەکمان هەڵنا، لە لای سەرەوە مشەمایەکی گەورەمان پێدا دا، جوان بەستمانەوە، ئێستا ماین بووە خاوەن تەویلەیەکی گچکۆکە، باران تەڕی ناکات، تەویلە هێندە دوور نیە لە هۆدەکەی خۆیان.

لە نزیک دەرگەی ماڵەکەیان بن تیشە بەردێکمان تەواوێ هەڵکۆڵی، بە شێوەیەک ئەگەر باران بە باوەش بباریێ، نەیگرێتەوە، ئەوە بۆ ئاگرکردنەوە و شیولێنان، ناوی بووە ناندێنەکەی ئاشیبا.

لە تەنیشتە وی، لە پاڵ بەردێکی گەورە، بەردمان هەڵچنی و بە مشەما جوانمان داپۆشی، جێی مەنجەڵێکی کوڵ و دانیشتنی کەسێکی لێدەبێتەوە، ئەوەش سەرشۆرکی ئاشیبا.

ڕێی سەرکەوتن بۆ ماڵی ستی و کەریمیشمان خۆشکرد، جێ جێمان هەڵکەند و هەندێ بەردی پانمان بۆ پێ لە سەردانان دانا، شێوەی پەیژەی وەرگرت، من هەر ئەو زستانە ناوم لەو هۆدەیە نا، هۆدەی ئەوین، ئەوانیش ئەو ناوەیان گەلەک لە دڵ خۆش هات، دواتریش هەر بە هۆدی ئەوین خستمە ناو داستانەوە.

ستی بە تەویلەکە گەلەک گەشایەوە، ئەگەر بابی و ئاغاش لێی خۆش بان، هەر هێندە لێی دیاریدەدا، هێندە مەمنوونم بوو، شەرمم لە خۆم کرد، لە خۆشیا دەیویست خۆ بەباوەشم دادا، ستی گەلەک جوان بوو، جوانیی کچانی شار و دێی بۆ خۆی بردبوو، لەبەر جوانی چاوم لە بەری هەڵنەدەهات، یەکەم جاربوو، وا لە نزیکەوە بیبینم، هەر نەمدیتبوو، هێ لەو جارەی لە سەر ماینەشێ دیتم و بەندێکم بە سەردا هەڵگۆت، لە سەر نانخواردنێ بە بیرم هێناوە کە بەندێکم پێدا هەڵگۆتیە و ئەویش ناوی لێنام مەلای داستان، رێگرتن و بەندەکەی بیرکەوتەوە، بەڵام چەندی کردی، ناولێنانەکەی بیرنەکەوتەوە، گوتی:

ئەو رۆژەی تۆ دەیڵێی، رووداوێ روویدا، باڵێ روا، ئێمەی گەیاندە ئێرە.

کەریم پێکەنی:

ئۆی! ئەو رۆژە بووە کە من بە باڵی ئەوین فڕیم و لە سەر کانیەکە نیشتمەوە.

ستی:

کانیەکەش ناوی گۆڕا بۆ کانی ئەوین.

ئیدی لەو رۆژەوە هەردووکیان بە مەلای داستان گازیان دەکردم، منیش دەمگۆتە ستی، براژن، بەڵام ئەو، ئەو براژنەی لە دڵ خۆش نەدەهات، دەیگۆت:

تا مەلایێ پەیدا نەبێ، من براژنی تۆ نیم.

وابوو، براژن نەبوو، کەریم بۆی باسکردم، لەکاتی خەوتنێ تفەنگەکەم لەنێوان هەردووکمان رادەکشێ، تا مارەی نەکەم، هەر وادەبێ.

گۆتمە کەریم:

دەڵێی چی، بە زەبری خەنجەرێ مەلایەک بهێنم و...

گوتی:

نابێ، ئەوە نابێ، ئەگەر وام کرد، جیاوازیم نامێنێ لەگەڵ ئاغا.

بە سرتە پێمگوت:

من دەچم لە کن مەلایەک خۆم فێرە چۆنیەتی مارەکردن دەکەم، قسەکان فێر دەبم و دێم لێکتان مارە دەکەم، چ دەڵێی؟

گرژیەوە و بە دەنگی بڵند:

ئەوە نابێ، ئەوجا لۆ ناچی لە سەر مردووانیش بخوێنی!

هەر ئەو رۆژە، ستی سێ چوار پارچە زێڕی دا دەستم:

ئەوانە بفرۆشە، خەرجیی ئێمە و خۆتی پێبکە.

زۆر هەوڵمدا وەرینەگرم، کەڵکی نەبوو، بە هەردووکیان بە زۆر خستیانە بەرکم، گوتیان:

وەرینەگری، لە برسان بمرین، نانێکت لێ وەرناگرین.

ستی ئەوەشی گۆت:

وا چاکە لە شوێنێکی دوور و بە نهێنی بیفرۆشی و کەس پێنەزانێ.

وام کرد، برادەرێکی جووم هەبوو، ئەو بردی و بە جۆرێکێ پارەوە هاتەوە، ئیدی ئەو جستانە، سەرم لێیان نەبڕی، پێیەکم هەر لەوێ بوو، حەفتەی جارێک دوو، بە ئاشیبادا هەڵدەگەڕام، نەمهێشت نە ئەوان نە ماینەشێ برسی بن، سەرمایان بێت، ڕەژووشم بۆیان دەبرد، دوندی ئاشیبا، ئەوەی خراپە، بێ داروبارە، زستانەکەشی گەلەک تووش و سارە.

ئەو زستانە هەواڵی ئاواییم بۆیان دەبرد، هەر چەندە من نەدەوێرام بچم، بەڵام بۆم دەهات، هەواڵی دایکیان، هەواڵی ئاغا و بابی ستی و هەڕەشەکانیان، تێمگەیاندن کە ئاغا بە هەڕەشە و چاوترساندن، بە بەرتیل و چاونووساندن، کارێکی وای کردووە، لەو ناوە کەم کەس زاخ بکات پەنایان بدات.

ئا، پارەیەکی گەلەک زۆریشی دامێ، بۆ دووربین ستی گوتی:

دووربینێکم دەوێ، چ کەسێ نەیبێ، هێند نزیک بکاتەوە، ئەستێرە بهێنێتە سەر کۆشم.

پەیدام کرد، ئەوەی ئەو ویستی کرپیم، لەو دووربینە کەس نەیدیتبوو، چ ئاغایێ نەیبوو، چ دووربینیێ! باڵداری لە ئاسمانێوە دەهێنایە ناو دەستت، لە پێدەشتەوە، ئاشیبای هێند نزیک دەکردەوە، بە خۆهەڵدانێ دەگەیشتییێ، ستی بە دووربینەکەش گەلەک دلخۆش بوو، زوو زوو بە چاویەوە دەنا و تەماشای دنیا و ئاوایی خۆیانی دەکرد.

ئەو زستانە، لە ستی و کەریمی سەر دوندی ئاشیباوە، شتێ لە ئەوین تێگەیشتم، زانیم ئەوین چ لە مرۆڤ دەکات، چەند ناسک و میهرەبان و مرۆڤدۆستیان دەکات، لە چاویانەوە ئەوینێکم خوێندەوە، بەر لەوان تەنها لە لاوک و حەیران، لە چیرۆک و داستانان بیستبووم.

کەریم دەتگۆ دەیزانی، رۆژێ دێ، لە شایی و داوەتان، لە دانیشتن و کاروانان، دەیانلێمەوە و دەبنە داستان، وردو باریک سەربردەی ئەوینی خۆیانی بۆم دەگێرِایەوە، ستیش بە شەرمەوە، تۆزێ باسی سەر کانیی ئەوین و ئەوانەی کرد.

ئەز لەگەڵیان بووم تا شەوی ئاگرەکە، تا باڵگرتن و...

## ٢٢

بایەک هەڵیکردووە، زەلام دەبات، کەپکە شاخ هەڵدەگرێ، پڕووشەی لەگەڵە، سارد سارد، دەڵێی مووسە دەبڕێ، کەریم ئالیکی دایە ماینەشێ، بە بنە تەنەکەیەک پۆلووەوە، بە گاگۆڵێ خۆی کرد بە هۆدەی ئەویندا، دەرگاکەی بە پارچە تەنەکە و مشەبا جوان داخستەوە، تەماشایەکی باوێرەکەی سەرەوەی کرد، دڵنیابۆوە نەگیراوە و هەواگۆڕکێ مسۆگەرە.

ستی لە پێخەفێ هاتە دەرێ و لە تەنیشت کەریم بە دیار ئاگرەوە دانیشتن، دیتی کەریم هەڵدەلەرزێ و چۆقە چۆقی ددانی دێ، دەستەکانی خستە نێو دەستی خۆیەوە و لە ئاگرەکەی نزیکردنەوە، دەستی زۆر ساردن، وێناچی بە ئاگر گەرمبنەوە، دەیانخاتە، سەر سینگی خۆی، دەست لە ڕوومەتی دەدا، دەڵێی شەختەن، ڕوومەتیش هی ئەوە نیە بە ڕەژوو گەرمبنەوە، بە ڕوومەتی خۆیەوە دەنێ.

تێکدەئاڵێن، رادەکشێن، کەریم لچکی پەتووەکە رادەکێشێ، دەکەونە ناو پێخەفەوە، سەرما نەما، هێند گەرم داهاتن، پۆلووەکان لەوانەوە گەرمایی وەردەگرن، ستی بە دەنگێکی پڕ لە حەز و تاسەوە دەڵێ:

کەریم، لە بیرت نەچێ، تفەنگەکە بێنە نێوانمان.

کەریم لێو لە لێوی و دەست لە سینەی دەکاتەوە و دەڵێ:

دڵنیابە، تفەنگم لەبیرناچێتەوە.

بە کزی و دڵشکاوی لێک دەبنەوە، ستی بەرکۆژەی دادەخاتەوە و دەسرۆکە دەخاتەوە جێی خۆی و پرچی ڕێکدەخاتەوە و دێنەوە دیار ئاگرەکە.

ستی هەستا، چوار هێلکەی هێنا، لە تەنیشت پشکۆکان خستنیە بن خۆڵەمێشەوە.

کەریم چۆوە دەرێ و لە چاوترووکانێ، پەقرەجەکەی بن بارانێی هێنایە ژوورێ، ئەو پەقرەجەی ئاوی بارانی دەگرتەوە، ئاوێکی روون روون، خلتێکت تێدا نەدەدیتەوە، باران نیە، لە بارانی سەری ئاشیبا روونتر و بێگەردتر.

ستی بە پەلگرەکە سێ چار پۆلیی گچکەی خستە سەر خۆڵەمێشی سەر هێلکەکان:

بە من بڵێ، ئەو هەورولێڵە تاکەیە؟

کەریم دەستی گەیاندە قلە قەسپێک و کردیە دوو کەرت، یەکیانی خستە زاری ستیەوە:

ئەو زستانە وێدەچێ زۆر بە باران بێ، هەورەکەی ئەوڕۆ پێناچێ هێندە بارانەی پێوە بێ، بەڵام، بایەکەی بێ ئامانە، بەرد دەهەژێنێ، ئەها جاروبار دەڵێی فوو بە شمشاڵدا دەکات.

ستی:

خەمی شێیە جوانەکەمە، بەو بایە گوێم لە حیلەشی نابێت.

کەریم:

خەمت نەبێ، جێیەکەی کەم با دەیگرێتەوە، پێشمگوت کە نەحیلێنێ، تۆ بە من بڵێ، ئەو ماینەت چۆن کردە ئەستێرک؟

ستی:

تۆ لە مەڕ هەور و بارانەوە، گەلەک وەڵامی منت داوە! بە راست تۆ دەزانی شمشاڵ بژەنی؟

کەریم:

نا

ستی:

کوو دەبێ، شوان هەیە لە دنیایێ، نەزانێ شمشاڵ بژەنێ؟

کەریم:

ئا، یەک شوان هەبوو، ئەویش منم، کەس هێندەی من حەزی لە شمشاڵ نیە، چەندی کردم، فێر نەبووم، هەر هێندەی ئەو بایە فێر بووم.

ستی:

ئێ، کەواتە شتێکی لێدەزانێ.

کەریم:

شمشاڵ لە کن من زۆر پیرۆزە، ئەگەر نەیزانی باش بیژەنی، گوناحە لێو و پەنجەی پێوەنێی، شمشاڵ زمانی ئەوینە...

ستی:

دەزانی بەژنی تۆ کتومت شمشاڵە

کەریم لێوی لە لێوی ستی نزیکردەوە:

دە ها لێوی پێوەنێ.

ستی بەر لەوەی لێوی بگەیەنێتە لێوی:

بەڵام ئاگات لە تفەنگەکە بێ.

ئەوجارە زۆری نەمابوو، کار لە کار بترازێ، بۆیە هەر یەکە لە لای خۆیەوە و بەبێدەنگی و بێوەی بەویدی بڵێ، هەرێیان دا کەم بچنە ئامێزی یەکترەوە، بە سووکە ماچێ دڵیان ئاوبخواتەوە، هەرێی خۆشیان بردە سەر.

ئەو ڕۆژەی ستی لە خۆشووشتنێ سەرمای بوو، لەرزێکی گرت، بە باوەشی کەریم نەبا، بە چ داو دەرمانێ گەرم نەدەبۆوە، کەچی کەریم، زۆر بە خۆیەوەی نەگوشی، ترسا لەوەی تفەنگ و مەلای لەبیربچێتەوە.

بەفریش نەیخستنە ئامێزی یەکترەوە، بەفرێکی ئەستوور کەوت، شەو و ڕۆژێ لێینەکردەوە، سێ شەو مایەوە، ئاشیبا لە دوورەوە دەتگوت پەلە هەورێکی سپیە بە ئاسمانەوە، لە نزیکەوەش، لە ماڵی ئەوینەوە پارچەیێ سەهۆڵی شووشەییە، نێوان دەرگەی ئەوین و ماینەشێ کۆڵانێکی تەنگەبەری پەیژەیی بەفرە، ئەو سێ چوار شەوە، هی ئەوە بوو، ئەو دوو ئەویندارە بە ئاشیبا کەوتووە، بە شێوەیەک ئاوێزانی یەکتر بن بە ئاگریش لێکدی نەبنەوە، کەچی لە ناو پێخەفێ پشتیان لێکدی دەکرد و تفەنگیش لە نێوانیان، جاروبار پەنجە گوشینێ، نەرمە ماچێ، هێندە و بەس.

ئەو ئێوارەیەش کە کەریم بە کوڵ گریا، ستی نەیوێرا پڕ بە دڵ سەری بە سینگی خۆیەوە بنووسێنێ و توند بیگوشێ، ترسا لەوەی گەرمیی لەشی بە شێوەیەک بڕژێتە لە شیەوە، بە بارێکدیدا بکەوێ و بگۆڕێ و بەرگەی نەمێنێ، ئەو ئێوارەیەی لە سەر ڕۆیشتن، مەلای داستان، هەواڵی مەرگی ئەبراهامی هاوڕێی پێگەیاند، کەریم تاسا، لە جێی خۆی وشک بوو، ڕەنگی سپی هەڵگەڕا، بووە پەلکە پیاز، هەناسەی گیرا، ستی بە زۆر هێنایەوە ناو هۆدەی ئەوین، لەپڕ لە پرمەی گریانی دا، فرمێسک سێ ڕێز سێ ڕێز دەهاتنە خوارێ، ستی نەیدیتبوو، گریانی کەریمی نەدیتبوو، بە دیاریەوە ئاگری گرت، وێنەی سکڵ داگیرسا، نەیدەزانی چی بکات، لە ئامێزی گرت، فرمێسکانی بە لێو سڕیەوە، فرمێسکی کەریم سینگ و بەرۆکی

ستی تەڕکرد، ستی دەیویست وەهای بگوشێ بیخاتە ناو سینگی خۆیەوە، بەڵام ترسا...

- گیانەکەم، وا بکەیت، کارێزیش بێت، هەڵدەچۆڕێیت و بۆ مەرگی من سێ دڵۆپە فرمێسکت لە چاو نامێنێ.

کەریم دەستی خستە سەر زاری ستی:

وس، باسی مردنی خۆت نەکەیت.

+ ئێ، منیش بەرگە ناگرم بە گریانەوە بتبینم.

- باشە تەواو، من لە شار دوو برادەرم هەن، ئەوە یەکیان بوو، زۆرم خۆشدەویست.

+ تۆ هەر کەسێکت خۆش بوێ، جێی بەهەشتە، ناوەکەی بە هی فەلە و جووان دەچێ.

- ئا، جوو بوو.

+ منیش لەو سەردانەی بۆ شارم کرد، کچە جوویێکم ناسی و زۆرم خۆشویست، دەی...

ئەو رۆژانەی باران لێی دەکردەوە، سەرمای کەمێ دەشکاند، لە هۆدەی ئەوین دەهاتنە دەرێ، بای باڵیان دەدا و وەک دوو کۆتری پەراگەندەی شاباڵ هەڵکێشراو باڵی هەڵفڕینیان لێکدەدا و پێیان

دوو سێ بست لە زەوی دەبۆوە و لە جێی خۆیان دەنیشتنەوە، جاروباریش نیشانەیان دادەناوە و ستی یەک دوو فیشەکی دەتەقاند و لە ناوەندی نیشانێی دەدا، کەریم دەیگۆ:

وا بڕوا، بای من دەبڕی.

ستی دەیگۆ:

وای چەند حەزدەکەم، وەک تۆ دەستم راست بێ و...

کەریم دەڵێ:

وای منیش چەند حەزدەکەم، وێنەی تۆ، بێ زین و هەوسار، سواری ماینەشێ بام و...

هەور و لێڵ و تەمتومان نەبا، دنیایان لێوە دیار بوو، بەڵام نەدەگەیشتنە هیچ کوێ، نەدەگەیشتنە بناریش، ئاوایی لە بن دەستیان بوو، دەستیان نەدەگەیشتێ.

ستی دەچووە لای ماینەشێ و ماچی دەکرد، بۆنی دەکرد، قسەی بۆ دەکرد، ماینەشێ چ نەما فێر نەبێ، هەر بە ناو و لەش ماین بوو، وەرنا لە هزر مرۆڤێ بوو لەو گۆڕە، لە قسەی ستی تێدەگەیشت، بەڵام زمانی وی وشە نا، نەرمە حیلە و سەر راوەشان، کلک بادان بوو، ماینەشێی وا بارهێنابوو، بە ئامازەیێ لە مەبەست تێبگات و بێ وەستان جێ بەجێی بکات.

کەریم گۆتە ستی:

کیژێ، دە منیش فێری زمانی ماینەشێ بکە.

ستی لە پێکەنینان لە سەر پشت دەکەوێ:

هێ لە من، کەس فێری زمانی شێی من نابێ، تۆ مەمنوون بە، وا سواری دەبی و بە دڵی خۆت رایدەتەرێنی، بۆت بۆتە ماستی مەییو و دەتناسێ.

کەریم بە پێکەنینەوە دەڵێ:

دەتوانی وا بکەیت نەمناسێتەوە؟

ستی ناو لەپێ لە شانی دەدات:

زەحمەتە، چوونکێ بە کەین و بەینمان دەزانێ.

کەریم دەچێ، دەست لە ملی ماین دەکات و بە ئەسپایی، هەر ئەوەتا ستی دەیبیستێ:

ئەگەر دەتزانی، من ستیم چەند خۆشدەوێ، زمانی منیش فێر دەبی.

ستی دەستی کەریم دەگرێ و دەڵێ:

وازی لێبهێنە، دەزانێ، بەڵام فێر نابێ.

باران دەمێکە لێیکردۆتەوە، هەور هەڵیپرینگاندووە، ئاسمان دەڵێی گۆمەشینەکەی پشت ماڵانە، ئەوەی لە بەهاران دەتگوت

چاوێکی شین شینە بە پێڵووی کەسک دەور دراوە، ئەو گۆمەی ستی بە منداڵی کوڕانە بە پەلە بەردی پان، ماستاوی لێدەخواردەوە، دنیا روون روون، دەڵێی لە گەرماوێ و بە سابوونێ حەلەبێ شووراوەتەوە، ستی بەبیریدێتەوە، ئەو جارەی سەردانی شاری کرد، لە گەرماوەکەی بن قەڵاتێ، بەو سابوونە سەری خۆی شووشت، ستی لەسەر ئاشیباوە، لە شینیی ئاسمان و جوانیی دنیا، دەگەیشتەوە منداڵی و لەوێوە بۆ شار و ئاشیبا، ستی چاوی بە دووربینەوە و لێناکاتەوە، کەریم دەپرسێ:

ستی، چ جێیەکت دۆزیەوتەوە، وا ئاگات لێرە بڕاوە.

ستی چاو لە دووربین ناکاتەوە:

+ جگە لە دوو جێ، دنیا هەمووی دیارە.

- کوێ؟ ماڵی خۆتان و....

+ ماڵێ مە جوان دیارە، ئەوی دیار نیە، گۆمی منداڵی و قەڵاتە.

- تۆ بە دیتنێک چاک حەیرانی قەڵات بوویت.

+ زۆر، بریا ماڵمان لەوێ دەبوو، ناوە ناوە لە پەنجەرەیەکەوە، دەمڕوانیە شار، کەس هەیە چووبێتە سەر ئەو قەڵاتە و دڵی لەوێ بەجێنەمابێ، دار و دیواری بۆنی مێخەکیان لێدەهات، ئەو جوانیەی لەوێ دیتم، نەمدیتەوە، بریا ئەمن و تۆ لەوێ، چاوەیەکی گچکۆکەمان دەبوو.

- چ دوور نیە، ئەو بریایەت بەر بگرێ.

+ من ئێستا کە زۆر بیری شار دەکەم، لەبەر دیاریەکەیە، لەگینە کچە نەخشکارەکە تەواوی کردبێ.

- بە منت نەگۆ دیاریەکە چیە؟

+ با خۆت ببیینی، هەینێ...

- هەر چی بێ، وەک تۆ دەیخەمە سەر سینەمەوە.

ستی دەستی بۆ سینەی خۆی برد، داخوا، دەسرۆکە لە شوێن خۆیەتی، مابوو.

- ئەدی بۆچی وا تامەزرۆی گۆمەکەی؟

- ئەو شەوەی سەری خۆمان هەڵگرت، بە دانیشتنەوە بۆرژا بووم، نازانم نە خەون بوو نەخەیاڵ:

من و تۆ بە دیار گۆمەکەوە شاییمان دەکرد، ژن و منداڵی ئاوایی چەپڵەیان بۆ لێدەداین، ئەرێ تۆ چ لە خەونان دەزانی؟

+ نا ...

ئەها، ئەوە بە دایکم دەچێ، لە خوار ماڵێ مە، لە سەرەوەی دارتووەکە، هەست دەکەم رەشاییەک دەجوولێتەوە.

کەریم دەڵێ:

زەحمەتە لێرەوە کەس بناسرێتەوە، بیدە من.

دووربینەکەی لێوەرگرت و تەواوێ چاوی گێڕا:

من هیچ نابینم، کچێ ئەو چاوانەی تۆ چەند جوانن، هێندەش تیژن، بەڵام ئەها دەڵێی لە لای گۆڕستان شتێ رەش دەچێتەوە! نا، چ دیار نیە، چاوم رێشکە و پێشکەی کرد.

کەریم لە دەست خۆی نەبوو، هەر جارێ دەستی دەدایە دووربین و لە ئاوایی دەڕوانی، بەر لە هەر جێ گۆڕستانەکەی دەکەوتە ناو چاوانی.

لە سەری ئاشیباوە، ئاوایی ماڵ ماڵ دیارە، جگە لە ماڵی کەریم و یەک دووانێکیدی کە کەوتوونەتە پەناوە، هەورەبانی ماڵی ئاغا لە هەمووان جوانتر دیارە، خۆ دووکەڵی سۆبەی ماڵان دەتگوت ماری ڕەشە و لە سەر کلک راوەستاوە.

کەریم دەڵێ:

ئێمەش نابێت هێندە خۆمان دەرخەین، نەوەک کەسێ دووربینێکی لەوەی ئێمەی هەبێ.

- نا، ئەدی مەلای داستان نەیگۆ لەوەی ئێوە لەو ناوە نیە.

+ وای گوت، بەڵام دنیایە...

کەریم هەستایەوە و بەری خۆی دایە بەری دوندی بێژینگ بە سەری، دەستی خستە سەر شانی ستی:

- هەستە، گەواڵەیەکی رەشی هێنا، لەوەیە بارانێکی باشی پێبێ.

+ زوو دادەکات، یان درەنگ؟

- بە ئالیکدانی ماینەشێ رادەگەین.

+ خۆزی وەک تۆ لە زمانی هەورم دەزانی.

- نابێ، هەر مرۆڤێ زمانی ماین و هەور بزانێ، دەچێتە ریزی پێغەمبەران.

+ ئەرێ کەریم، دەزانم گوناحە، بەڵام هەر دەپرسم.

- پرسیاری شتی گوناح مەکە.

+ نا، زۆر گوناح نیە، دەڵێم ئەوە لۆ لە ناو ژنان پێغەمبەرەک هەڵنەکەوت، خودا نەیویست، یان؟

- نازانم، بە خودای هیچ لەوە نازانم، بەڵام مارە باب، ئەگەر لە دەست من بێت تۆ دەکەمێ، تا...

+ وس، وس، تۆبە تۆبە، ما خرا، خۆ قسەکەی تۆ زۆر لە پرسیارەکەی من گوناحتر بوو.

ئەگەیشـتنەوە سـەر دەرگـا، هەور شـۆڕابەی دا، ئاشـیبا ڕەش داگەڕا، دایکردە ڕێژنە بارانێ.

لە تەنیشت یەک ڕاکشابوون، ستی سەری لە سەر قۆڵی کەریم تفەنگیش لە نێوانیان، ستی بە دەم خەو بردنەوەوە قسەی دەکرد:

+ کەریم، ئەوڕۆژ ڕۆژی مایە؟

– بە گوێرەی هەڵکردنی بای ئەو چەند ڕۆژە، بای وادە بێ، هەر حەفتەیەک، کەمتر، سبەی دووەی مەلای داستان بێ پێدەکەوین.

+ ئەوجا ئاگرێکی گەورە دەکەینەوە، وەک ئاگرەکەی تۆ.

– دەکەینەوە، بەڵام گەورە نا، چوونکە هێندە دارەمان نیە.

+ گۆتت چ ڕۆژ ئەوڕۆزە؟

– نازانم ئەوڕۆ چەندی مانگە، بۆیە بە تەواوی نازانم.

+ ئەگەر رادیۆمان هەبا، دەمانزانی.

– باشە ئێمە بۆ زوو بیرمان لە کڕینی ڕادیۆیەک نەکردەوە؟ خۆ زێڕی ئاغاژن بەشی ئەویشی دەکرد، تازەش هیچ، هێندەمان لێرە نەماوە، دوای ئاگر و شکانی سەرما و سۆڵە ئاشیبا بەجێدەهێلین، وا نیە؟ ستی، ستی...

ستی چۆتە خەوێکی ناسکەوە، دەڵێی چۆلەکەیە هەناسە دەدات، کەریم زاری لە زاری نزیککردەوە، ئەیگەیاندێ و هەستی لە

هەناسـەی راگـرت، حەزیـدەکرد ئەوگـرتەیە بە مانـگ و سـاڵ درێژبێتەوە، نەپسێتەوە و نەبڕێتەوە.

## ٢٣

شەو درەنگە، مەلای داستان بە بارێ دار و سەربارێ خـواردنەوە گەیشـت، باریـان داگـرت و هێسـترەکەیان لە بەردەم تەویـلەی مایـنەشێ بەستەوە.

هەیوەشەوێکە، ستی پێبکەنێ لە دوورەوە چاڵی سەر رووەمەتـی دەبینـی، مانـگ لە گـژە لە سـەر ئاشـیبا بنیشـێتەوە، ئەسـتێرە بەژنێکیـدی دابەزن، کەریـم بچێـتە سـەر دونـدە بڵنـدەکە، دەسـتی دەیانگـاتێ، کـزە بـایەکی ساردی دێ، دەنـا هـی ئەوە نـیە، بچـنە ژوورەوە.

رێـی مەلای داسـتانیان نەدا بگەڕێـتەوە، ئەو شـەوە لە هـۆدەی ئەویـن لای خۆیـان هێشـتیانەوە، ئەو شـەوە، سـتی نەخەوتەوە، لە ئێوارەوە خەوتبوو، تێر بووبوو، بە دیـار کەریـم و مەلای داسـتانەوە دانیشـت، هێنـد جـوان خەوتبـوون، ئیـزرائیلیش دڵـی نەدەهـات وەئاگایان بهێنێتەوە.

ستی گوێی لە حیلەی ماینە، ناسیەوە، حـیلەی ترسـە، تفەنگـی دەستداین و چووە دەرێ، رەنگە لە دڵنەهـاتن نەبـووبێ کە ئەوانـی ئاگادارنەکردەوە، لە گینە لەبیری نەبووبێ، ئـاخر کە حـیلەی شـێی بیست، ئاگای لە هیچ نەمـا، لە رێگا سـەختەکە چـووە خـوارێ، لە خوار تەویلەکە تارماییەکی دی، لە مرۆ دەچوو، فیشەکێکی پێوەنا،

چـــاوەڕێیە بـــکەوێ، نەکەوت، فیشـــەکێکیتری هاویشـــتە بەری و هاویشتی، تارمایی بزر بوو، کەریم و مەلای داستان گەیشتنە لای.

- چ بوو، چ بوو؟

+ زەلام بوو.

- دڵنیای زەلام بوو؟

+ ئا، زۆر پێدەچوو.

ستیان هێنایەوە ژۆرێ و بە پارێزەوە کەمێ ئەو ناوە گەڕان، لەو کاتە دایکردە باران، ئاسمان چ زوو ئەو هەورەی خڕکردەوە، مەگەر تەنها کەریم بزانێ، ئاخر کاتێ لە بن مانگەشەوێ گۆتیە ستی:

ئەوشۆ رەنگە باران بباری.

ستی گۆتی:

پێموایە، ئەو جارە ئاسمان بە قسەی تۆ ناکات.

ما لە دەوری ستی بسووڕێن و ترسی برەوێننەوە.

مەلای داستان:

من دڵنیام گورگ بووە.

ستی:

گورگت دیتووه له سەر دوو پێ بڕوات و هێندەی تۆش درێژ بێ!

کەریم:

مرۆڤ کاتێک دەترسێت، پشیلەی لێ دەبێتە دێو، من خۆم بە سەرم هاتووە، دووریش نیە، حیلەی ماینەشێ بۆ هێسترەکە بوو بێت، لەبیریچوو بێت، ئەو لەوێیە، لە پڕ دیتبێتی و...

ستی:

شێی من شت لەبیرناکات، ئێوە هەرچی دەڵێن، بڵێن، ئەوەی من دیم زەلام بوو.

مەلای داستان:

منیش دەڵێم، بەو تەڕ و تووشیە، بێجگە لە گورگ، ئیزرائیلیش ناگاتە ئێرە.

کەریم روو لە مەلای داستان:

لە بەدبەختی ئێمە، بارانیش دایکرد، دەنا ئێستا رووناکبێتەوە، شوێنپێی گورگەکەمان نیشانی ستی دەدا.

روو لە ستی:

ئێ، دە برۆ بە ماینەشێ بڵێ، ئەوی تۆ دیتت چوار پێ بوو وەک تۆ، یان وەک کەریم دوو پێ؟

ستی پێکەنی و گوتی:

دوور نیە من ترسابم، واز لەو بابەتە بێنن، لە خەویشم کردن، دە بخەونەوە، ئەوجارە تەقە لە تارمایی ناکەم، تا هەڵدەستن، چایەک لێدەنێم.

هەندێ تۆ چایان هەبوو، بەڵام شەکر نا، بە قەسپ دەیانخواردەوە، ماستێکیان هەیە، پارووی تێناچێ، بە دیتنی ماستەکە، گەیشتەوە منداڵی و لای دایکی، کاتێ ماستی مەڕ پەیدا دەبوو، دەیگۆ:

دایە، خورماستم دەوێ.

دایک، کەمێ خورمای دەکردە پارچەی ورد ورد و لەگەڵ بنپیاڵەیێ ماست، جوان جوان تێکەڵی دەکردن و...

باران لێیکردەوە، ڕۆژێکی خۆش، پەلە هەورێ بە ئاسمانەوە نەما، بارانەکە هەر بۆ ئەوە بوو، شوێنپێی تارماییەکە ڕەشبکاتەوە، لە نێوان مرۆڤ گورگ بە نهێنی بمێنێتەوە و بۆ ستی رووننەبێتەوە، داخوا کامیان بووە.

ئەوڕۆ نیشانەی چوونی ڕەشەمێ و هاتنی خاکەلێوە جوان دیارە، زەوی لێوی کردۆتەوە و دەشت و دەر کەسک دەچێتەوە.

ستی پتر خەمی لە نەدیتنی گزنگ دەخوارد، داینابوو، ئەو سپێدەیە دەرکەوتنی یەکەم تیسکی گزنگ ببینێ، دوو سێ جار دیتبووی، دەیگۆتە کەریم:

سەری ئاشیبای ئەوەی زۆر جوانە، لەپێش هەموو جێیەک گزنگی لێدەکەوێ.

کەریم چاوێکی لە سەر رووخساری ستی و چاوێکی روو لە گزنگێ، دەیگۆ:

گزنگ، گزنگ دەگرێتەوە.

دەکەوتنە ئامێزی یەکترەوە.

مەلای داستان و کەریم لەگژ خرکردنەوەی کەلوپەل و رێکخستنەوەی شوێنەکەن، بە شێوەیەک بە سرووشتی بکەنەوە و دەستکاریی بنیادەمی هێندە پێوە دیار نەمێنێ، ستی لای لیژنە دارەکە لە سەر بەردێ، بە دووربینەوە روو لە ئاوایی دانیشتووە و جێ جێ لە دوای دایکی دەگەڕێ، کەریم دێتە لای:

- ها، دۆخی ئاوایی کووە؟

+ کشومات دیارە، دایکم دیت، لە لای دارتووەکە دەگەڕایەوە ماڵێ، ئێستا داخوا چ قورێک دەپێوێ.

- به مەلای داستان دەڵێین، دوایی به هەر شێوەیەک بێ، هەواڵی ئێمەی بۆ ببات و هەینێ بێ خەم دەبێت و کەڵەکەی دەکەوێتە عەردێ.

ستی چاو بە دووبینەوە دەستی بەرەو ئاوایی درێژکرد:

کەریم، داخوا لە دنیایێ شتی وا هەبێ، ئاوایی و دایکت لە بن دەستت بن و ئاگایان لێت نەبێ؟! نەوێری بڵێی دایە، ئاوڕدەوە ئەوەتا لێرەم...

کەریم، دەستی لە ملی کرد، دووربینەکەی لێوەرگرت:

ستی، تێدەپەڕێ، ئەوەش تێدەپەڕێ، دڵێ من، بێنێ خۆ فرەهـ-کە.

دووربینی بە چاویەوە نا، دوای گۆڕستان، چاوی کەوتە سەر گۆڕاییەکەی پێش ماڵی ئاغا:

- وێدەچێ ئاغا مێوانی هەبێ.

+ بە چ دەزانی؟

- کۆمەڵێ سوار لە پێش ماڵیانن.

+ ئەوانەشی هەر بۆ ئێمە....

- سوارانی عارەبیش لە خۆ خڕکاتەوە، ماینەشێی پێناگیرێ.

لەگژە ئاوایی بکەوێتە بن سێبەری ئاشیباوە، بە خێرایی نانیان خوارد، مەلای داستان ئەوەی دەبوو بیبات، لە هێسترەکەی بارکرد. تەویلە و ناندێن و سەرشۆرک شوێنەواریان نەمابوو، رێگای گەیشتن بە ماڵی ئەوینیش، دەستکاریی مرۆڤی پێوە دیار نەمابوو، ئێستا تەنها ماڵی ئەوین ماوە...

رۆژ ئاوابوو، زەردەی نەما، لیژنە دارەکە داگیرسا، مەلای داستان، تەوقەی لەگەڵ ستی کرد، ئامێزی بە کەریمدا کرد:

زۆر وشت و وریا بن، زماندز زۆرە، وەک گوتم، بە رێی کانی داودەرەشدا بدەوە زوورگەزراو، لەوێ...

مەلای داستان هەوساری هێستری راکێشا، تا لە پشت تاشە بەردەکان بزر بوو، ئاورِی دەدایەوە، ستی و کەریم بە دیار ئاگرەوەن، کوڵمی ستی پشکۆی گەشاوەن، لێوی خونچەی دوا رۆژی رەشەمێن و بۆ خاکەلێوە پشکوتوون، بەژنی نەونەمامی نەورۆزە، بای داراوس بە دیار ئاگرەوە دەیهەژێنێ، لە چاویەوە نمەی ئەوین دێتە خوارێ، کەریمی بەژن شمشاڵی، دەستی گرتووە و پێکەوە گۆرانیەکی نەرم دەڵێنەوە، بۆ یەکتری دەڵێن، گۆرانیەک پێشتر کەس نەیبیستبوو، گۆرانیەک زادەی ئەو ئێوارەیەی سەری ئاشیبا بوو، بە دەوری ئاگردا دەسوورِێنەوە:

**بە دەنگە دەنگە، بە ناڵە ناڵە**

**بەژنێ کەریم شمشاڵە، هەی لۆ**

بە شنە شنە، بە کاڵە کاڵە

دەنگی ستی من، شەماڵە، هەی لێ

بە دەنگە دەنگە، بە ناڵە ناڵە

بەژنێ کەریمم شمشاڵە، هەی لۆ

سپی بێگەردە، بەفر و گژلۆکە

رووەتێ ستی، نەینۆکە، هەی لێ

شۆڕە سوارە، شیرن رەشتارە

لاوکێ دڵێ من، بەکارە، هەی لۆ

هەر خۆت سواری، هەر خۆت گوڵناری

فریشتەی خودا، نازداری، هەی لێ

گازکە ماینەشێ، با بێتە پێشێ

هەناسەبڕکێیان پێکەوتبوو، بە دیار پشکۆوە، دانیشتن:

ئێ، دوای گازکە ماینەشێ، ئەویدی...

ستی دەستی خستبووە سەر سینگی خۆی و توند هەناسەی دەدا:

له...بیرم....چوو

کەریم دەستی لە ملی کرد:

ئەوانەی گوتت، بە بیرت دێنەوە؟

ستی:

لەوانەیە، ئا، ئەدی تۆ؟

کەریم:

منیش، تۆ بیلێیەوە، بە بیرمدێنەوە، شەو درەنگە، دەبێت تۆزێکیدی بەڕێبکەوین.

ستی:

لە ئاسمان بپرسە، بزانە کەی دەبارانێ.

کەریم:

پرسیم. پێناچێ، ئەو یەک دوو ڕۆژە ببارێ، ئەگەر بشبارێت، چی وا نیە.

ستی:

ئێستا ئاوایی دەڵێن: دیسان ئاشیبا پەرچووی نواند.

ئەوەی پێویست بوو، بە زینی ماینەشێوەیان کرد، بە شێوەیەک باوێر و دەرگای هۆدەی ئەوینیان گرت، تەنها ئەگەر ئەوینداران بیبیننەوە و بزانن ئێرە دەرگا بووە، باوێڕێ هەبووە، بە رێی کانی ئەویندا شۆڕبوونەوە.

+ وا دەڕۆین بەر لەوەی تاو بکەوێ، لە ئاقاری ئەو ئاواییانە دەربچین.

- تفەنگ لای خۆم دەبێت، ئەگەر شتێ بقەومێ، دەزانم تۆ دڵت نایێ تەقەیان لێبکەی، ئەگەر بێنە رێمان، خودا لە سەر سەرانە بەر لە هەمووان، بابم...

+ باشە، با لای تۆ بێ، مەترسە هیچ نابێ...

لە نزیک کانی ئەوین سوار بوون، هاتن، دایانەوە چەپی شێخەلاس، لە چەمەکە پەڕینەوە، دنیا کەمێ رووناکی تێکەوتبوو، بەڵام هێشتا گورگ و سەگ لێکنەدەکرانەوە، ستی ئەو بنە دارەی ناسیەوە کە لە نزیکەکە وی، پیری لاس لە بن زەوی هاتە دەرێ و بووە مێوانی بابی، لە بن لێوانەوە:

دەی پیری لاس، ئەوجارەش برۆ خەونی بابم، پێی بڵێ واز لە کچەکەی بهێنێ، برۆ خەونی ئاغاش پێی بڵێ واز لە ستی نەهێنی، لەگەڵ خۆم دەتبەمە بن زەوی.

کەریم دەڵێ:

ستی، ئەوە لەگەڵ کێ دەدوێی؟

ستی:

لەگەڵ پیری لاس.

کەریم:

ئەوەی مایینەشێی پێدای؟ بەرۆکی بەردە، ئەو کارە بەو چارە ناکرێ، خۆ بگرە، باڵدەگرین.

لەو ساتە، ستی هەستیکرد لە سەر بەرزاییەکەی تەنیشتیان، تارماییەک دەرکەوت، گوتی:

کەریم، سوارێک وا لەو سەرە.

کەریم:

وەک سەری ئاشیبا مەکە.

قسەی تەواو نەکردبوو، گیزەی گوللەیێ هات، ستی کە تفەنگی سوارکردبوو، فیشەکێکی تێگرت، کەریم دیتی سوار گلا، مایینەشێ باڵی گرت، کلکی ناوە ناوە بە شێوەیەکی وا بەرزدەکاتەوە، لە ناو شانی ستی دەخشێ، بۆتە قەلغان بۆ پشتی ستی.

لە هەردوو بەری رێوە گوللە دێ، کەریم دەڵێ:

وا دیارە، لە هەردوو بەر خۆیان دامەزراندووە، تەقە لە هەردوو لا بکە، چ نیە، دوورن...

ستی دەڵێ:

رووم وەرنەگێرم، ناخێوێمێ.

کەریم:

تەقە بکە، کاتی ئەوە نیە.

سوارێکیدیش، ستی خۆش، ماینەشێ باڵی گرت، وا دیارە، ئەوێران بە دوایان کەون، ماینەشێ هێوری کردەوە.

+ کوو زانیویانە، لە بەری ئاشیبابن؟

- ئەو تارماییەی شەوێ دیتم...

+ پێناچێ، نازانم...

هێور هێور بە پارێزەوە رێ دەبڕن، ستی زوو زوو ئاوڕدەداتەوە و تفەنگەکەشی سوارە، کەریم دەڵێ:

وا بزانم دوو کەست کوشت.

ستی بە شێوەیەک، روون نیە لە دڵەوەیە یان لە توورەیی:

ئەگەر یەکیان بابم بێت و ئەویدی ئاغا، ئا...

کەریم:

ئیدی، دەبێت هێندە دووربکەوینەوە، خەیاڵی ئاغاش نەیگاتێ.

گەیشتنە سەر کانی داودەڕەش، لە دوورەوە شوانەکەی ناسیەوە، ئەوەی مەلای داستان باسی کردبوو.

پشووێکی باشیان دا، تیکە نانێکیان خوارد، جۆرکە جۆش وا بە سەری مابنەشێوە، شوانە چایەکی لێنا، بە قەسپەوە خواردیانەوە، شەکر بە گوللە دەستناکەوێ، شوان روو لە کەریم، جارناجاریش تیچاوێ دەداتە ستی، بەڵام وەک ئەوەی لەو سپێدەیەی یەکەم رۆژی خاکەلێوەی رۆژی نەورۆزێ، خۆری خەرمانانی، لە دەمی نێوەڕۆیی بە سەر سەرەوە بێت، چاوی دادەخات و هەست بە گەرمایی و سووتان دەکات، شوان دەڵێ:

دنیا بە ئێوەی زانیوە، ئاغا لێرەوە تا شاری تێگەیاندووە، هێ لەوەی بە خۆتان دەزانن، هەرکەسێکیش شوێنی ئێوە ئاشکرا بکات، جووتێ هێستر و دەمانچەیەک و جێی سێ عەربە گەنمان بە دیاری دەداتێ، بەڵام خەڵکەکی گەلەک زۆر هەن لە ناو چاوی خۆیان دەتانپارێزن و ئامادەن خۆیان بەلاگێڕتان بکەن.

شوان ناونیشانی ئەو ماڵەی بۆیان هەڵدا کە لەو دیوی زوورگەزراو وەریان دەگرێ، دەبێت تا ئێوارە لەو زوورگە بمێننەوە، بە شەو بچنە ئاواییەوە، گوتی:

دەمەو ئێـوارە، لەو دیـوی زوورگ گیـابڕنکێ دەبیـنن، پشـتی پێببەستن و چی گۆت، وا بکەن.

پیاوەکە لە کاتی خـۆی دەرکەوت، لە دوورەوە و بە پێکەنیـنەوە گوتی:

شۆڕەسواران، ئێوەش وەک من گیای دەرمان کۆدەکەنەوە؟

کەریم گوتی:

ئا، بەڵام گیا هێشتا سـاوایە، بـاش ناناسـرێنەوە، مـن هەر گـوڵە خەزێمە و حاجیلە دەبینم.

گیابڕنک:

کەریم، ما ئەتو لەبەر گوڵەستی چ گوڵان دەبینی!

پیاوێکی گفتولفت شـیرن بـوو، هێنـدە لە نـاو گـوڵ و گـژ و گیـا ژیـابوو، بـۆنی بەهـار و کەسـکایی گرتبـوو، تیچـاوێکی دا سـتی و گوتی:

دوو سێ بەهارە، گوڵ گوڵ، بەهار دەگەڕێم، لە قەرەچووخەوە تا سەفین گەڕاوم، تا گوڵێ ببینمەوە لە هەموو گوڵان جوانتر...

کەریم بزەیەکی بۆ ستی کرد و گوتی:

وا بزانم ئێستا دیتتەوە!

گیابڕنک پەنجەی بۆ ستی درێژکرد:

نا، ئەو گوڵەم پێشتر دیتووە، من لە بەهار دەگەڕێم تا گوڵێکی وەک ئەو گوڵەی تۆ جوان ببینمەوە، تا ناوەکەی خۆی لێ بکەمەوە و ناوی بنێم: گوڵە ستی.

کەریم: خۆت ماندوو مەکە، نایبینیەوە.

ستی گوتی:

تۆ منت لە کوێ دیتووە؟

گیابڕنک:

بەهارێک لە سەر ماینەشێ، لە ڕێی ئاشیبا.

ستی:

ئەگەر گوڵێکت بە ناوی منەوە کرد، کەریمیش لەبیرمەکە.

گیابڕنک:

جێی کەریم ناو چاو و دڵە.

هەر ئەو دەمەو ئێـــوارە و لە زاری گیـــابڕنکەکەوە، هەواڵیـــان پێگەیشت کە دوو لە نۆکەرانی ئاغا بە دەستی کەریم بریندار بوونە، بەڵام برینیان سووکە، گیابڕنک باسی ئەوەی بۆ کەریم و ستی کرد کە قارەمانێتی کەریم دەنگی داوەتەوە.

ستی کە بیستی کەسی نەکوشتووە زۆر دڵخۆش بوو، کەریم پێیگوت:

بە دڵمە، یان لە پێ بدە، یان لە شانی ڕاست، بە گوللە بڵێ بە لای دڵ و سەردا نەچێ.

ستی بە پێکەنینەوە:

تۆش هەر نێوچەوانی ئەسپان دەسمی!

کەریم پێکەنین بە پێکەنین وەردەگرێتەوە:

کەریمی ئەسپکوژ ناوی بە قارەمان دەڕوات، کەچی ستی...

## ٢٤

نێوان ئاشیبا و گردی پیرداود، بۆ کەریم و ستی سێ مانگەی بەهار بوو، ئەو بەهارەی ئەو دوو ئەویندارە بە مایندەشێوە، لە سێ چوار ئاوایی ئەو دەشتەی هەولێرێ مانەوە و چەند ماڵێکیان گۆڕی، زۆر جار وابووە، لە ترسی ئاشکرابوون، ماینەشێیان لە دیوی دانیشتن خەواندووە، ئەو شەوانەی دوو بە دووش لەدیوێ دەمانەوە، لە کاتی خەوتن تفەنگیان لەبیرنەچووە، لە نێوان خۆیان خەواندوویانە، ئەو بەهارە، ئەو دوو ئەویندارە بوونە کەوی ناو رکە، سێ چوار رۆژی لێ دەرچێ، لە کونێ ژۆرێ بەهاریان بە سەربرد و کەسکایی و گوڵیان لە کولانکەوە دیوە.

ئەو بەهارە، یارانی ئەویندارن، ستی و کەریمیان لە ناو چاوی خۆیان پاراست و بە برژانگ نۆبەتداریان لێیان کرد، لە هیچ ماڵێ بۆ ساتێکیش رووێکی گرژیان نەدی، کەریم دەڵێ:

رۆژێ دێ، بتوانم چاکەی ئەو خەڵکە بدەمەوە.

ستی:

بە چی؟ چاکەی ئەوانە نادرێتەوە.

کەریم دەڵێ:

ستی، به منت نەگۆ، بۆچی تەنگاوت کردم کە ماڵە جۆلاکە بەجێبهێڵین؟

ستی:

چەند لە سەر شتان دەڕۆی، وازی لێبهێنە، شتێکی وا نەبوو.

کەریم:

باشە، بەڵام بزانە لە سەر دڵم بۆتە گرێ.

ستی:

با نەبێتە گرێ، دەیڵێم، بەڵام سوێندم بۆ بخۆ، وەک ئەوەی نەتبیستبێت.

کەریم:

وەی هەزار جار، بڵێ سوێند بە چی بخۆم؟

ستی:

بەو ئەستێرەیەی تۆی لە مووسڵەوە گەیاندەوە ئاشیبا.

کەریم:

کەواتە دەبێت دوو سوێند بخۆم، ئەدی دوو ئەستێرە نەبوون!

٢٤

نێوان ئاشیبا و گردی پیرداود، بۆ کەریم و ستی سێ مانگەی بەهار بوو، ئەو بەهارەی ئەو دوو ئەویندارە بە ماینەشێوە، لە سێ چوار ئاوایی ئەو دەشتەی هەولێرێ مانەوە و چەند ماڵێکیان گۆڕی، زۆر جار وابووە، لە ترسی ئاشکرابوون، ماینەشێیان لە دیوی دانیشتن خەواندووە، ئەو شەوانەی دوو بە دووش لەدیوێ دەمانەوە، لە کاتی خەوتن تفەنگیان لەبیرنەچووە، لە نێوان خۆیان خەواندوویانە، ئەو بەهارە، ئەو دوو ئەویندارە بوونە کەوی ناو رکە، سێ چوار رۆژی لێ دەرچێ، لە کونێ ژوورێ بەهاریان بە سەربرد و کەسکایی و گوڵیان لە کولانکەوە دیوە.

ئەو بەهارە، یارانی ئەویندارا‌ن، ستی و کەریمیان لە ناو چاوی خۆیان پاراست و بە برژانگ نۆبەتداریان لێیان کرد، لە هیچ ماڵێ بۆ ساتێکیش رووێکی گرژیان نەدی، کەریم دەڵێ:

رۆژێ دێ، بتوانم چاکەی ئەو خەڵکە بدەمەوە.

ستی:

بە چی؟ چاکەی ئەوانە نادرێتەوە.

کەریم دەڵێ:

ستی، به منت نەگۆ، بۆچی تەنگاوت کردم کە ماڵە جۆلاکە بەجێبهێلین؟

ستی:

چەند لە سەر شتان دەڕۆی، وازی لێبهێنە، شتێکی وا نەبوو.

کەریم:

باشە، بەلام بزانە لە سەر دڵم بۆتە گرێ.

ستی:

با نەبێتە گرێ، دەیڵێم، بەلام سوێندم بۆ بخۆ، وەک ئەوەی نەتبیستبێت.

کەریم:

وەی هەزار جار، بڵێ سوێند بە چی بخۆم؟

ستی:

بەو ئەستێرەیەی تۆی لە مووسڵەوە گەیاندەوە ئاشیبا.

کەریم:

کەواتە دەبێت دوو سوێند بخۆم، ئەدی دوو ئەستێرە نەبوون!

بە دوو ماچەوە سوێندی بە چاوە ئەستێرەییەکانی ستی خوارد، ستی ئانیشکی خستە سەر رانی کەریم و شەوەکەی ماڵی جۆلای وا گێڕایەوە:

لە شیرنەی خەوێ بووم، هەستمکرد لێوێ وا بە سەر روومەتمەوە، وای بۆ چووم تۆ بیت، چاوم کردەوە، تاریک بوو، جوان رووخسارم نەدی، زانی وەئاگاهاتووم، ماچێکی توندی کرد و هەڵات، هاتە سەرم بقیژێنم، باش بوو خۆم گرت، لەو ساتە، ژنی جۆلا وەئاگا هات:

+ چ بوو، کچم چ بوو؟

- نازانم، وا بزانم پشیلە بوو.

ئیدی هەر دەبێت یەکێک لە کوڕەکانی بووبێت، لە دڵێ خۆ گوتم با رۆژ ببێتەوە هەر دەبێت پێبکەوم، ئەو شەوە نەخەوتم، سبەینێ نەگەیشتە چێشتانێ، لە رێی چاوەوە زانیم گەورەکەیانە، ئەوە بوو، گۆتم: کەریم، دەبێت لێرە بڕۆین و تۆش بەبێ ئەوەی بپرسی لۆ؟ گوتت: دەڕۆین دەڕۆین، بە دڵی تۆ.

کەریم چاوی ستی ماچ کردەوەو گوتی:

هەر ئەوەش بوو، لە سەر دڵی منت کردبووە گرێ، کچێ ئەو کوڕەیان کەمێ تام گێل بوو.

پووشـپەڕە، خشـەی پـووش و پەڵاشـە، شـەماڵێ هەڵیکـردووە، سـتی وا هەسـتدەکات لە ئـامێزی دایکـیەوە دێ، مانـگ لە سـەر ئاوابوونە، پیرداود لەگژە دەکەوێتە تاریکیەوە، ستی دەڵێ:

زۆر زوو ئاوبوو

کەریم دەڵێ:

من چ پێوستم بە مانگ نیە، مانگی خۆم وا لە ئامێزمە.

ستی خۆی دەهاوێتە ئامێزی:

+ تۆ بڵێی لە دەستیان دەرباز بین؟

– بۆ دەرباز نابین، دنیا و بنیا گەڕان نەیاندیتینەوە، خەریکە لە بیریان بچینەوە، ئێمەش دوور دەڕۆین تا کوێستانەکان گیرنابین.

+ لەوێ مەلا...

– لەوێ کێ ئاغا دەناسێ، کێ حـوکمەت دەناسـێ، لەوێ مەلا بە خۆشیەوە...ئەرێ ستی، دووربینەکەمان هێنا؟

ستی ناولەپێکی توندی لە لاڕانی خۆیدا:

دەستی شکاوم! لە سەر تاقەکە بوو، لەبیرمچوو.

کەریم دەستی ستی دەخاتە ناو دەستی خۆی و دەڵێ:

کیژێ، ئەو دەستە ناسکە بۆ دووربین دەشکێنی؟!

ستی:

دووربینەکە بۆ ئێمە زۆر پێویست بوو.

کەریم:

لە بیری خۆتی ببەوە.

مایینەشێش ماندووە، لە تەک وان راکشاوە، زۆریشی لێبکەی حیلەیەکی لێوە نایە، ئەو چەند مانگە، ستی هێندە لە سەر نەحیلاندن رایهێناوە ئاغاشی بۆ بێ، ناحیلێنێ، لە برساش گیان بدات، نەرمە حیلەیەکی لێ نابیستی.

با دەنگی پێیەکی هێنا، هەر دەبێ ئەو بێ، کۆخەیەکی کرد:

- کورە شاری تۆی؟

+ هەوم.

کورە شاری، رازی ناسینەوە بوو، تاریکە، لە تاریکی چاکوچۆنیان دەگەڵ یەکتر کرد، پرێسکەی دایە دەستی کەریم، ئەویش دایە ستی:

هەستە خۆت بکۆرە.

ستی چووە پشت مایینەشێ...

دنیا کەمێ ڕووناهی تێکەوت، کوڕیژگە سەری مەنجەڵە ماستی کردەوە، نانی خستە سەرکۆشی کەریم و ستی.

نوێژیانە و بەڕێکەوتن، ئەو ڕێیە نابڕێتەوە، بەوەش پتر درێژدەبێتەوە لە هەندێ شوێن ڕێ دەگۆڕن و بە ناچاری شار لە خۆیان دووردەخەنەوە.

لە سەرەوی ئاوایيەک لە بن کەپرێکەوە، پیاوێکی ردێن سپی هاتە دەرێ:

+ سوارۆ لادەن، دۆیەک بخۆنەوە.

– مەمنوون، ئاوەدان بێ، تینوومان نیە.

پیرە کەمێ تێیان ڕاما:

کەریم، لادەن، لە من مەترسن.

کەریم داما، پرسی:

– خارە، ئەو ئاواییە ناوی چیە؟

+ تیمار

– ئەها

بیریکردەوە کە بیستبووی لەو ئاواییە زۆر کەس هەن، ئامادەن، بیانشارنەوە، نەهێڵن بکەونە دەستی ئاغاوە.

دابەزین، پیرە تەماشای جلکی ستی کرد و گوتی:

ئەوە زۆر گچکەیە بۆی، نابینی...، دانیشن، هەر ئێستا، جلکێکی پڕ بە بەری دەهێنم، یەک پێ بەرەو ئاوایی رۆیی، کەریم تەماشای ستی کرد:

- خۆ، راست دەکات.

+ دەڵێم، شتێکی لە بن سەر نەبێ، دەسکیس نەبێ، با بڕۆین.

- مەترسێ، باسی ئەو ئاواییە و ئەو پیاوەیان بۆم کردووە، دەزانم نیازی پاکە.

زۆری نەبرد، پیرە بە جلک و کۆتکێ دۆوە هاتەوە، گوتی:

وەرە لە بن کەپرێ خۆت بگۆڕە، من رۆیشتم، خودا چەپارەتان بدات، ئەگەر تفەنگەکەت پاسی نیە، ئاگاداربە، پۆلیس نەیبینێ.

کەریم:

دەزانم، مەمنوون.

هێشتا هەر لە ناو ئاقاری ئاوایی بوون، دیتیان لە بەری جادەوە، سوارێ دەڵێی تیرە دێ، لە دوای خۆی لوولەی تۆزێ دەنێرێتە ئاسمانێ، ستی دەڵێ:

کەریم، یان ماینەشێ بفڕێنە، یان تفەنگم وێدە.

کەریم رووی ماینەشێی رووە و تاقە سوار وەرسووڕاند و گوتی:

ئەو سوارە بە نەیار ناچێ.

تفەنگیشی سوارکرد، سوار نزیککەوتەوە، هێوری کردەوە، هێشتا بەردهاوێژێ نێوانیان بوو، دەستی دۆستانەی بەرزکردەوە، گەیشت، دوای چاکوچۆنی:

راسپاردەیەکم پێیە بۆ ئێوە.

لە بەر باخەڵی پرێسکەیەکی گچکەی دەرهێنا، گچکە هەر هێندەی کلدانێ:

ئەو پیاوەی گیا دەرمانان خڕدەکاتەوە، ناردی، گوتی: پێیانبڵێ، ئەوە تۆوی (گوڵەستی)یە...

من رۆیشتم، خودا چەپارەتان بدات.

ستی دەڵێ:

کەریم، تۆوی گوڵە ستی چیە؟

کەریم ئەو رۆژەی بیرکەوتەوە، کە بۆ بای باڵێ، بە شێوەیەک شێوەی خۆی گۆڕیبوو، مەگەر ستی، دەنا ئیزرائیلیش نەیدەناسیەوە، بە دزیەوە لە ئاوایی دەرچوو، گەڕانێکی ناو کەسکایی بەهاری کرد، لەو ئاقارەی کە خوێنی حەسەن و مەریەمی لێ ڕژابوو، تووشی گیابڕنکەکە بوو، بۆ گوڵ و گیا دەگەڕا، کەریم

به ناوێکیدی خۆی پێناساند، لەوێ گیابڕنک گوڵێکی دیتەوە، لە شێوە لە مەمکەکیژە دەچوو، سپێتیی بەیبوون و زەردێتی خەزێمە و کەمێکیش سوورایی گوڵناری تێدا بوو، بۆنیشی کار لە رەشە رێحانەی تەڕ نەبوو، بۆنێکی تایبەت بە خۆی هەبوو.

هەردووکیان بە دیار ئەو گوڵەوە مەست و حەیران دانیشتبوون، کەریم پرسی:

ئەو گوڵە ناوی چیە و دەرمانی چ دەردە؟

گیابڕنک:

نازانم، من گەرمیان و کوێستانم کردووە، بە ناو هەزار جۆری گوڵدا هاتووم، لەو گوڵەم نەدیتووە، وێدەچێ لەم بەهارەدا لە وڵاتێکی دوورەوە هاتبێ، با تۆوەکەی هێنابێت.

کەریم کەمێ داما، گوتی:

نا، لە دوورەوە نەهاتووە، من ناویشی دەزانم و دەشزانم چ دەردێ دەپەڕێنێ.

گیابڕنک، لە خۆشیا وەک گوڵەکە گەشایەوە:

ئەوە تۆ بەراستتە؟

کەریم گوتی:

بەڵێ، ئەو گوڵە گوڵەستی دەڵێنێ.

گیابڕنک دەستی خستە سەر شانی کەریم و سەری لێ خوار کردەوە و بە سەر سوڕمانەوە:

تۆ! تۆ کێی؟ کە...

کەریم باوەشی پێداکرد، سەر و گوڵیان لە گوڵەستی قرتاند...

ستی دەپرسێ:

ها کەریم، لە کوێی؟ من پرسیارێکم لێکردی.

کەریم:

لای تۆم، لای پرسیارەکەتم، چ زوو لەبیرت چوو؟ ئەها ئەو ڕۆژەی بێ تۆ چوومە دەرێ، بە گوڵێکی بۆن خۆشەوە گەڕامەوە...

ستی بەبیریهاتەوە:

ئەها، گوتت: گوڵەستیم بۆ ستی هێناوە.

کەریم:

ئا، ئەوجا ئەو پیاوە دیارە هەر بە دوای ئەو گوڵەوە بووە و تۆوەکەی گرتووە، بۆی ناردووین.

ستی:

وای لەو پیاوە گوڵە، خۆزی دەمدیتەوە و دەستەکانیم ماچ دەکرد.

کەریم تۆوی گوڵەستی خستە بەر باخەڵی لای چەپی.

ڕۆژ یەک دوو باڵی مابوو، منارەی چۆلی دەرکەوت، کەریم بە پێکەنینەوە گوتی:

عەزیز، ئێستا دەتوانی خۆت بکەیتەوە ستی.

دابەزین و ستی و کورتەک و شەرواڵەکەی داکەند کە بە سەر کراسەکەیدا هەڵیکێشابوون و مشکی دانا و ڕەفتەکەی کردەوە سەری، بە پێکەنینەوە گوتی:

تا کەینێ، دەبێت بە ڕۆژ عەزیز بم و بە شەو ستی؟

کەریم:

زۆر نەماوە، بگەینە کوێستانێ هەموو گوڵەکانی ناو دەنێم ستی.

لە تاریکی خۆیان بە شاردا کرد، لە لای مەزاری عوزێر پێغەمبەر، لە گۆڕستانەکە، ستی ماینەکەی لە نێوان کێلان لە شێوەی حوشتر یەخ کرد، گوتی:

ئێوە لێرە بمێننەوە، ماڵی پلکم لەو دیوەن، باچم بیانبینم، هەینێ...

ستی چوو، زۆری پێنەچوو گەڕایەوە، بە ستڵێ ئاوەوە:

+ ماڵیان لێرە نەماوە، چوونەتەوە گوند.

- نەتزانی چ گوندێک؟

+ نا، دراوسێ جووەکەیان نەیدەزانی.

چوو ئاوەکەی لە پێش ماینەشێ دانا، چۆڕبڕی کرد.

- ئەوە چیە لە دەستت؟

+ عەبا، کچە جووەکە دایمێ، گوتی: بەو شەوە بۆ چوونە سەر قەلاتێ، باشترە ئەگەر عەبات بە سەرەوە بێت.

- تۆ چ کارت بە سەر قەلات هەیە؟

+ دەبێت بگەمە لای کیژە نەخشکارەکە، دڵنیام ئەو دەزانێ ماڵیان چۆتە کوێ، ئەو کچە منی زۆر خۆش دەوێ، لێی مەترسە، ئەگەر زانیبێتیشی نەک هەر تووشم ناکات، دەشمپارێزێت، بزانم دەسرۆکەکش...

کەریم زۆر هەوڵیدا بەو شەوە خۆ لە قەلاتێ نەدا، کەلکی نەبوو، ستی دایە لاملی و ملی بۆ کەریم نەدا.

+ باشە، ئەگەر نەیزانیبوو، تۆ شەو لای ئەو بمێنەوە، منیش لای تفەنگ و ماینەشێ، باشە بەو شەوە چۆن ماڵیان دەبینیەوە؟

- شتی وا نیە، زوو دەگەڕێمەوە لای تۆ، خەمت نەبێ ئاسان دەیبینمەوە، ئەوە ستڵەکەش بۆ ماڵەکە دەبەمەوە.

لەوەش بە قسەی خۆی کرد، بە ناچاری:

چۆن دەڵێی با وابێ، بەڵام ئەو شوێنەمان باش، نیە، من جێم دەگۆڕم.

بە وردی باسی ئەو گۆڕستانەی بۆ کرد، کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی قەڵاتەوە و بە دەستی چەپی خانوویەکی گەورەدا کە جێی بادە خواردنەوەیە دەیگەیتێ، ناوی گۆڕستانەشی پێگوت، ستی عەبای بە سەر خۆیدا دا، کەریم تا بزر بوو لە بەژنی بن عەبای ڕوانی:

وای خوایە، لە بن عەباشەوە چەند جوانە.

ستی تۆزێ ڕۆیی گەڕایەوە.

- چ بوو، چیت لەبیرچوو؟

+ دێمکەکەم بدێ، ئاوی ساردت بۆ دێنم.

ستی بە دێمکە و ستڵەوە ڕۆیی.

کەریم پێی خستە ڕکێفێ، نەگەیشتبووە سەر زینێ، دەنگێکی ناسک:

شۆڕەسوار، ماندی نەبی.

خۆی هەڵدایە سەر زین و ڕووی ڕووەو دەنگەکە وەرگێڕا:

خۆش بی یاخوا...

ناسکتر لە جاری پێشوو:

دەڵێی نامناسیتەوە...

گوێی کەریم بەو دەنگە ئاشنایە، بەڵام جێیەکە روونـاک نـیە و رووخساری جوان دیارە نیە:

دەنگت نامۆ نیە، بەڵام...

کەمێکیتر هاتە پێشێ:

بۆ ئەوە هاتم کە بڵـێم ئەو فریشـتەی لە گەڵـتە لە چـاوی خـۆت باشتر بیپارێزە، زۆر وریای خۆتان بن، ماڵی ئێمە بۆ ئێـوە دەرگـای لە سەر پشتە، ئێستا بە ستیشم گوت...

کەریم خۆی هەڵدایە خوارێ، هێندەی نەمابوو ئامێزی پێدا بکات:

گوڵەندام گیان، ئەوە تۆی؟

کەریـم گریـا، بە کـول گریـا، هـێ لە سـتی کەس کەریمـی بەو گریانەوە نەدیبوو، گوڵەندام بۆ گیرکـردنەوەی، بـاڵی کـردەوە تـا لە ئامێزی بگرێت، شەرم دەستەکانی بەست، بە گریانەوە گوتـی:

مەگری، شۆڕەسوار، مەگری، تۆ نابێت بگری.

کەریم فرمێسکی سڕی و هەناسەی ساردی هەڵکێشا:

من زوو، هەواڵی مەرگی جوانەمەرگی براتم بیست، بەڵام لەگینە بزانی من لە چ بارێکم و...

گوڵەندام بە گریانەوە:

من لەو چەند رۆژەی دوایی زانیم، تۆ و ستی ئەو کەریم و ستیەن کە...

- من لە چاکەی ئێوە دەرناچم و لە هەموو شتێ لێم ببوورە.

+ تۆ لە من ببوورە، ئەگەر دەمزانی ماڵی دڵی تۆ ستی تێدایە، بە چ رووێکەوە لەو دەرگایەم دەدا، دەی لەوە گەڕێ، وەرنە ماڵێ مە، پاریزراون.

- نابێ، گوڵەندام، خوشکە نازدارەکەم، نابێ، دەستی داک و بابت ماچ دەکەم، پێڵاوی تۆ دەخەمە سەر سەرم، نابینە ئەرک بە سەر کەسەوە، ئێمە دەڕۆین.

+ من دەزانم، ژیانتان لە مەترسیە، ماوەیێ لە ماڵێ مە بمێننەوە، بابم چارەیەکتان لێدەکات.

- ترسێکی وا نیە، دەڕۆین.

+ دڵم دەترسێ، بە قسەم بکە.

- مەترسێ، خوشکە جوانەکەم.

+ من درەنگ زانیم خوشکی تۆم، برۆ، برا جوانەکەم، لە خـودا و مووسا دەپارێمەوە، پارێزراو بن.

کەریم هەنیەی ماچ کرد و گوتی:

من یەک خوشکم هەیە، ناوی گوڵەندامە.

کەریم سواری مایەنەشێ بوو، دایەوە بەری کەندەکە، بە پشت گەرەکی جووان سووڕایەوە، بە تەنیشت کوورەچیان پەڕیەوە بەری گۆڕستانەکە، لە کن مەیدانێ کەران، هەڵوەستەیەکی کرد، هەستیکرد دڵێ گۆڕستانی جووان دەخوازێ، سەر گۆڕی هاوڕێکەی خۆی، براکەی گوڵەندام دەخوازێ، سەری مایەنەشێی بەرەو گۆڕستانی جووان وەرسووڕاند، کەمێ ڕۆیی، گەڕایەوە:

بەو شەوە گۆڕێک لە کوێ ببینمەوە کە لە خەونیش سەردانم نەکردووە.

چەند جارێ دەیویست سەرە خەیاڵی بباتەوە لای گوڵەندام، بەڵام خەمی ستی لێی دەپچڕاند، داخوا چۆن بگاتە سەر قەڵات و لەوێوە بگاتەوە گۆڕستان لای خۆی، تووشی شتێ نەبێ!

هاتەوە ناو کەندێ، لەوێوە بە دەستی راستی چراغدا سەرکەوت و دوور لە چاوی حەسحەس، خۆی بە گۆڕستانی شێخەڵادا کرد.

لە ناو کێلان، جۆرکی بە ملێ مایناشێوە کرد، تفەنگەکەی بە کێلێکەوە هەڵپەسارد، بەری گۆڕستان تاریکە پشتی دا کێلێک، روو لە چراکانی قەڵات، لێرەو لەوێ دبریسکێنەوە و تیشکیان تێکەڵ ئێکدی دەبنەوە.

سێ کەس وا بەرەو گۆرستان دێن، لەو دوورەوە بەو شەوە و لە بن عەباوە ستی ناسیەوە، نزیککەوتنەوە:

+ شێ، شێ، لەوێی؟

– لێرەم، لێرەم.

ئەوان گەڕانەوە و ستی خۆی بە گۆڕستاندا کرد.

+ زۆر هەوڵیان دا، تۆش ببەم و لایان بمێنینەوە، بەڵام...

– باشت کرد.

+ ئەوانیش بە ئەوینی کەریم و ستیان زانیوە، بەڵام بێجگە لە کچەکە نەیانزانی من ستیەکەی کەریمم، ئەوینی من و تۆ لە سەر زاری شارە، گەڕەک گەڕەک، کۆڵان کۆڵان، ماڵ ماڵ، زارەوزار دەکات، ناوی کەریم و ستی ناو قەیسەری دەگەڕێ، بە هەموو رێیەکانی قەڵاتێدا هەڵدەگەڕێ.

- ئێ، ماڵی پلکت؟

+ پـێکەوتم، لەو سـەرەوەن، هێنـدە دوورنـین، دیاریەکەشـم لای ویە، چەندی کردم و کۆشام، کرێی چنین و کێشانی وەرنەگرت.

- کەواتە، لەگەڵ مەلابانگدانی سبەینێ، بەڕێدەکەوین.

+ وادەکەین، وەرە دانیشە بخۆین.

- چیت هێناوە؟

+ دۆڵمە.

- ئۆ، گەرمیشە.

+ گەرمیان کردەوە، ئالیکت دا شێ؟

- ئا، خۆم لەبیر بکەم، شێ لە بیرناکەم.

+ ئای، ئەو کچە نەخشکارە، تامەزرۆی بینینت بوو.

- نەمبینێ باشترە.

+ لۆ؟

- بمبینێ، زگی بە تۆ دەسـووتێ، دەڵـێ: کیـژێ، تـۆی ناسـک و نازدار، ئەو کوڕە ڕەش و برژە...

+ بە خودای ئێرەیی بە من دەبات و دەڵێ: کوڕێکی واش بۆ من ببینەوەم منیش دەڵێم:

نیە، لەو شێوە تەنها ئەو کوڕە لە دنیایێ هەیە.

کەریم باوەشی پێدا دەکات.

- کەریم تۆ چوویتە سەر ئەو قەڵاتە؟

+ ئا، چەندان جار.

- وای چەند جوانە، چەند خۆشە، وا نیە؟

+ با، منیش زۆر حەزی لێدەکەم، با ماوەیەک لە کوێستانان بمێنینەوە، هەندێک کۆن بێت و لەبیریانبچێتەوە، هەینێ دێینەوە لە سەر قەڵاتێ خانووێک دەگرین و منیش دەست بە کرێکاری دەکەم، دەزانی من چەند مانگێک کرێکاریم کردووە.

+ چ کارەکت دەکرد؟

- لە سەر قەڵاتێ، کاری دیوار.

+ واتە، جێ پەنجەت بە سەر کەرپووچی قەڵاتەوە دیارە.

- ئەدی.

+ چەند خۆشە لەو خانووە بژین کە تۆ دیوارەکەیت هەڵناوە.

- بێ ئومێد مەبە، ئەو رۆژە دێ.

+ کەریم من زۆر حەزم لە شارە، تۆش؟

− منیش زۆر.

+ من ئەگەر مردم، حەزدەکەم لە شار...

کەریم دەستی خستە سەر زاری:

وس، باسی مردن مەکە، من بەوە تووڕە دەبم.

ستی دەستی خستە سەر شانی کەریم و گوتی:

بە راستیم نەبوو، هەر لۆ خۆشی.

کەریم لە دڵەوە:

لۆ خۆشیش باسی مردن بکەیت، خۆش نیە.

شەو درەنگە، لە تاریکایی گۆڕستانەوە، لە کەلێنی کێلانەوە، دەڕوانــنە درەوشــانەوەی شــار، دەڕوانــنە ئەو چرایــانەی لە پەنجەرەکانی قەڵاتەوە دەبریسکێنەوە، ستی دەڵێ:

گوند، لەگەڵ ماڵنووستنان دەچێتە تاریکیەوە، شار چرای لێ ناکوژێتەوە.

کەریم:

وا نیە، لە گوندی ئێوەش چرا هەبوو تا سبەینێ تیشکی دەدایەوە.

ستی:

کوا، له چ ماڵێک؟

کەریم:

له ماڵی ئێوه.

ستی خۆی خزانده ئامێزیەوه، ماچێکی روومەتی کرد:

ئەرێ، له ناو گۆڕستان، ماچ گوناح نیه؟

کەریم پێکەنی:

با، گوناحه، بەڵام با منیش گوناحێکی لەوەی تۆ گەورەتر بکەم.

لێوی خسته سەر لێوی ستی و تا هەناسه ما، مژی، ستی هەناسەی دایەوه:

هێندەی نەمابوو بخنکێم، باش بوو گۆڕستان بوو، دەنا تفەنگ و مفەنگت لەبیرنەدەما.

- تا نەگەمه مەلای گەوره، تفەنگم له یاده.

+ ئەو مەلا گەورەیه له کوێ پەیدا بوو، له کوێیه؟

- له سەر رێی کوێستانێیه، ئێستا به بیرم هاتەوه، مەلایەکی ناوداره، حەزدەکەم له سەر دەستی وی...

+ ئەوجا ئەو دەوێرێ؟

- ئا، دەسەڵاتی ئاغای ئاوایی مە بە خەونیش ناگاتە ئەوێ، دەی سەر بە کۆشم بکە و سەرخەوێ بشکێنە، ماندووی.

+ تۆ ناخەوی؟

- با.

کەریم هەر بە دانیشتنەوەوە، پشتی بە کێلەکە دا و پێی راکێشا ستیش سەری خستە سەر رانی و خۆی گرمۆڵەکرد:

دەستت بخە ناو پرچمەوە با زوو بخەوم.

بە پەنجەکانی کەوتە شانەکردنی پرچی خاوی دوای تۆزێ:

+ کەریم، دەڵێن گۆڕی حەسەن و مریەمیش هەر لەو ناوەیە.

کەریم دەمێ بێ دەنگ دەبێ:

ئا، بیرمکەوتەوە، هەر لەو گۆڕستانەن، دوور نیە هەر ئەو کێلە هی مەریەم بێ کە من وا پشتم پێداوە، رۆژ بێتەوە دەیناسمەوە، من جارێک دوو هاتوومەتە سەر گۆڕیان.

- ئەرێ کوشتنی ئەوان چۆن بوو؟ لە سەر ئەوین بوو؟

نا، ئەوان ژن و مێرد بوون، لە جەندرمە یاخی بوون، لەو دەشتەی خوارێ شەڕیان کرد و هەردووکیان پێکەوە کوژران و

تەرمەکانیان هێنانەوە شار و لێرە بە تەنیشت یەکەوە ناشتنیان، ئەرێ دە بخەوە، هێندە باسی مردووانیش مەکە.

ستی هەستاوە و سەری خستە سەر شانی کەریم:

+ خەوم نایێ.

- باشە، مەخەوە، بەڵام چیدی باسی مردووان مەکە.

+ باشە، ئەرێ دەڵێی ئەوشۆ مانگ هەڵنەهات!

- کچێ هەڵهات و هەلات و تۆ لە بەر رووناکایی شار ئاگات لە مانگ ما.

+ چما رووناکایی شار مانگیشت لەبیردەباتەوە؟

- ئا، ئەگەر زۆر تێکەڵی بیت.

+ نا، من ئەگەر لە سەر قەلات بم، مانگ لەبیرناکەم، لەوێوە لە ئامێزمی دەگرم.

- وا دیارە، تۆ ئەوشۆ ناخەوی؟

هەردەستێتەوە سەر پێ و روو لە قەلات:

+ نا، دەمەوێ چاوم پڕ بکەم لە شار.

بە غەمزەی چاوەکەی، عەقڵ و و دڵ و دینم بە غارەت چوو

- ئەو گۆرانیەش دەزانی؟ من ئەوەم بیستووە...

+ ئێستا، لە سەر قەلاتێ، پیاوەک بە دەفەوە دەیگۆت، وەی خوایە ئەوە چ دەنگ بوو، چ دەف بوو! بۆ تاوێ من خۆم لەبیرکرد، باڵم گرت، گەیشتمە ئاسمانێ، بە سەر قەلاتێ دەسووڕامەوە، کەریم، بەو خودایەی ئەو دەنگ و دەفەی بەو پیاوە داوە، تۆ لێرە نەبایت، من تا سبەینێ، بە ئاسمانی قەلاتێدا دەسووڕامەوە، من لە دەست چووبووم، تۆ منت گرتەوە، ئەوە چ بوو! چ بوو، چما دەنگ و دەفی وا هەیە؟ کچە نەخشکارەکە گۆتی نازانم کێ دەفزەنە، ئەها دەڵێی ئێستاش دەنگی دێ!

هەردووک بێدەنگ بوون و هەست و خوست و هەناسەیان لە خۆیان بڕی، بە ئاستەم دەنگی دەف دەهات، پێدەچوو، لەو سەری قەلات و لە ناو ماڵێکدا بێت، بۆیە دەنگی دەف کز دەهات.

+ کەریم، خۆزگە تۆش گوێت لێی دەبوو.

- ستی، من لە نزیکەوە بیستوومە، ئەوە عەبدوڵای دەفزەنە، کەس نیە شان لە شانی بدات، با، کەسێ هەبوو بەر لە سێ چوار ساڵێ گەیشتە بەهەشت، ناوی شەهابە بوو، ئەو کار لەوەش نەبوو، هەستانبێژ و بانگخوێنێ بوو، کەوی سەر ئاشیباش نازانێ وا بخوێنێ، تا ئەو مابوو، ئەو شارە یەک بانگخوێنی بەس بوو، لە

سەر قەڵاتەوە دەنگی دەگەیشتە هەموو کۆڵانێکی شـار، دەگەیشـتە گونـدەکانی نـزیکیش، وەی خـوایە، چ دەنگێکـی هەبـوو، ئەوجـا چ دەفێکی دەژەنی.

+ لەو دەفژەنەش خۆشتر؟

- ئەمەش گەلەک خۆش دەژەنێ.

+ خۆزی منیش، لە نزیکەوە ئەو دەفژەنە زیندووەم دەمدیت.

- لە نـزیکەوە دەفـت بـۆ لێـدات و دەنـگ هەڵبێنـێ، بە خـۆت ناوەستی، پرچت دەکەیتەوە، وەک دەروێشان دەکەویە سەما...

+ ئەگەر گوناح نەبێ، چەند خۆشە ئەو دەف لێدا و بەستە بڵـێ، من تۆش سەما بکەین.

- گوناح نیە.

+ کەریـم، هێـوارێ کـاتێ بە سـەر قەڵات کەوتـم، لە مـاڵێکی لای هێروە، گوێم لە گەنج خەلیلێ بوو، وای خوایە...

- تۆ کاوێزاغا دەڵێی.

+ ئا، هەستمکرد ئەو گەنج خەلیلە تۆیت و منیش لە گەڵ کچەکە دەمکوتەوە و وا گۆڕیم:

لە پاش کەریمێ خۆ نەمێنم لە دنیایێ.

- ستی، تۆ لە باسی مردن نەکەتی؟ وا دیارە دەزانی من دەمرم، کیژێ، پشتی من دەستبەرداری ژیان نەبی، بژی، هێند بژی تا منت لەبیردەچێتەوە.

ستی دەستی خستە سەر زاری کەریم:

وس، باسی منی دوای خۆت مەکە، مریەم چەند دوای حەسەن، خەجێ چەند دوای سیامەند ژیان، منیش دوای تۆ، هەر هێندە.

کەریم ناولەپی ستی ماچ کرد:

تکایە، چیدی قسە مەهێنەوە سەر مردن.

+ تەواو، باسی مردنی خۆمان بڕایەوە، بە من بڵێ تۆ ئەو کاوێژەت دیتبوو؟

- سەر بان و کۆڵانێ لێم دوور بوو، داخی گرانم نەمدی، ئەها، لەو دیوی ئەو یانەیە، قوتابخانەیەک هەیە، وا تێبگەم یەکەم قوتابخانەی شارە، ئەو جا لە پشت وێندەرێ، لە سەر بانێکەوە، چریکەیێ هات، بە لاوک و حەیران، هەموو گەڕەکی جووان و شاری هێنایە خرۆشان، گۆتیان ئەوە کاوێژاغایە، حەیرانەکەی مەست و حەیرانی کردم، ئەوەی باسی مامزەکەی خۆی دەکات و دەڵێ:

پارێزەکم دەبردێ، پارێزم لێ دەستاند.

ستی، من پاشان کە تۆم دی، هەستم کرد مامزی ناو ئەو حەیرانەی...

ستی:

من لە بەهەشتێش دەبمە مامزی تۆ، حەیف ئەو کاوێژە نەما، تا من تۆش بخاتە حەیرانێ، لاوکێکەوە...

- ستی، کەسەکەم، بخەوە، زۆر نەماوە رۆژ ببێتەوە و ببیەوە عەزیز.

+ ئەرێ بە راست، لەو هەموو ناوی زۆر، بۆچی عەزیزت بە منەوە نووساند؟

- گوتم با ناوە پیاوانیەکەشی ناوێکی ناسک و ئازیز بێ، هێ لە هەندێش، کاتی خۆی لێرە، لەو بازێرە، لە کرێکاری کورێکم ناسی، گەلەک شیرن و قسەزان و زیرەک و بەرێز بوو، ناوی عەزیز بوو.

+ ماڵیان لە شار بوو؟

- ئا، لەو دیوی قەیسەری، بەڵام نازانم ئێستا لەوێ ماون یان نا، دایکێکی هەبوو، ناوی وا تێبگەم سندوس بوو، زێدە جوان بوو، چیرۆکخوان بوو، خەج و سیامەند و ئەوانەی بە شێوەیەک

دەگێڕایەوە، باڵدار لە ئاسمانێ گوێی لێبوایە، دەکەوتە داوەستانێ، لە تەنیشتی دەنیشتەوە و گوێی بۆ رادەدێرا.

ستی دەستی لە ملی کەریم کرد:

- دەمویست ئەوە بپرسم، هەموو ئەو کوڕ و کچانەی زۆر یەکتریان خۆشدەوێت، بۆچی بە مرازی دڵ ناگەن و ...

+ وا نیە.

- کوو وا نیە؟! ئەوە مەم و زین، خەج و سیامەند، لەیل و مەجنوون، سورمێ و خورشیدی چاوبەخاڵ، ئەسمەر و مامەر، گەنج خەلیل و حەفسێ، ناوی چەندانت لۆ بژمێرم؟

+ ئێ، دە ناوی هەندەکانیش بڵێ کە بە مرازی دڵ گەیشتوون.

- نیە.

+ زۆرە، هێند زۆرە، لە ژمار نایەن.

ستی پێدەکەنێ و دەڵێ:

+ ئێ، ناوی چواریان بڵێ.

- ناویان نازانم.

+ تۆ گاڵتە بە من دەکەیت!

- نا، ئەوینداریی کوڕ و کچان دەزانی کەی دەبێتە بەند و بەیت و حەیران و لاوک؟ کەی دەکەوێتە ناو چیرۆک و داستان و سەر زاران و پشتاو پشت دەگێڕدرێتەوە و دەمێنێتەوە؟

+ کەی؟

- ئەو دەمەی بۆ یەکتر نابن، خۆ ئەگەر سیامەند و خەجێ بۆ یەکتر بان، ئێستا لە چ جێ ناویان نەبوو، زۆر کوڕ و کچ هەبوونە، لە مەم و زین پتر یەکتریان خۆشویستووە، بەڵام چوونکێ بە مرازی دڵ گەیشتوون و منداڵیان ناوەتەوە و پێکەوە پیر و خەرۆبوونە، بۆیە من و تۆ ناویان نازانین.

- ستی ئەدی ئەوە نیە، ناوی ئێمەش کەوتۆتە سەر زاری گوند و شار! خۆ هێشتا...

+ ئەوە چ نیە، کوا کەوتۆتە ناو بەندو حەیران؟ چ نیە، هەر چەند رۆژێکیدیە، ئێمە دووردەکەوینەوە و ناویشمان لای کەس نامێنێتەوە، وەکو ئەو هەواڵانەی لێدێ کە لە رادیۆوە دەبیسترێن و پاش چەند رۆژێ لە بیردەچنەوە.

ستی کەمێ داما:

ئێمەش ناومان ناوێ، خودایە، با نەبینە داستان، من ئامێزی کەریمم دەوێ و بەس.

دەچنە ئامێزی یەکترەوە.

- ئەریٚ، بە من بڵێ، ئەو کچە جووە لە کوێ دەناسی؟

+ کیهان کچ؟

- ئەوەی عەبا و ئاوی ...

+ گوڵەندام، ئێ، دەستەخوشکە جووەکەمە، تۆ لە کوێت دی؟

- بەر لەوەی عوزێر پێغەمبەر بەجێبهێڵم، هاتە لام.

+ کەریم، تێناگەم.

- ئەو کـچە خوشـکی ئەبراهـامی بـرادەرمە، ئەهـا کە لە سـەری ئاشیبا هەواڵی مردنیم بیست.

+ ئـۆی، ئەوەی هەورێـک فرمێسـکت بـۆی بارانـد، چمـا بـرای گوڵەنـدام بـوو! ئـێ، چـۆنی زانـی تـۆ لەوێـی؟ خـۆ مـن نـاوی تـۆم نەگوت.

- زانیبووی.

ستی بە پێکەنینێکی شیرنەوە:

وا دیارە کەینوبەینێکتان دە نێواندا هەبووە.

کەریم پێکەنینەکەی لێ وەردەگرێتەوە:

ئەو نا، بەڵام من نا.

ستی دەستی کەریم دەگوشێ:

گەلەک جوانە، شێخ و مەلا بۆی دەبنە جوو، تۆ چۆن هیچت لەگەڵ نەبوو؟

کەریم، توندتر دەستی دەگوشێ:

- ئاخر من تۆم هەبوو.

+ ئەها، واتە دوای دیداری کانی ئەوین، دەیناسی.

- نا، بەر لە دیداری کانی، بەڵام دوای ئەوینەکە.

+ ئەرێ من پێش تۆ، تۆم خۆشویستووە، یان تۆ؟

- هی من دیارە چ رۆژێ بوو، ئەدی نەمگوت لەو رۆژەی بۆ یەکەم جار دەستت بە بژی ماینەشێوە گرتبوو، بەرەو بناری ئاشیبا باڵت گرتبوو.

+ دەزانی هی منیش رەنگە هەر ئەو رۆژە بووبێت، ئەو رۆژەی شوانێکی بەژن شمشاڵیم دیت و ...

- ئێ، بۆ ناپرسی، ئەو کچە جووە، بۆچی هاتە ئەوێ و باسی چیتان کرد؟

+ دوایی ماینەشێ بۆم دەگێڕێتەوە.

- نەبادا ئەو باش گوێی لە قسەکانمان نەبوبێت، من بۆت دەگێڕمەوە.

کەریم رستە رستە، بێجگە لە ترسەکە، بێ پەڕاندنی پەیڤێ، گوتوبێژی خۆی و گوڵەندام، ئەوەی نزیک مەزاری پێغەمبەرەکە، بۆ ستیی گێڕایەوە، ستی گوتی:

چت دەوێ، ئەوە خوشکێکی جووت بۆ پەیدا بوو.

کەریم ماچێکی چاوی ستی کرد و گوتی:

من هەر زوو ئەوم بە خوشکی خۆم دانابوو، بەڵام ئەو درەنگ منی کردە برا، بزانە چیرۆکەکە...

ستی پەنجەکانی لەگەڵ پەنجەی کەریم تێکپەڕاند و گوتی:

گیانی من، خۆت بە گێڕانەوەی چیرۆکی لابەلایی خەریک مەکە، چیرۆکی من و تۆ...

کەریم:

وایە، بەڵام بە تەنیشت چیرۆکە درێژە نەبڕاوەکەوە، جاروبار وردە چیرۆکیشی تێدەکەوێ.

ستی:

قسەیتی، دە بگێڕەوە، ئەو گوڵەندامە دەم گوڵە، پرچ لاوەلاوەم بـۆ بگێـڕەوە، مـن ئەو سـاڵەی هـاتمە شـار لە یەکەم دیـتن خۆشمویست، بەڵام ئێستا زۆر پتر.

کەریم:

ئەو ساڵەی من لێرە کریکاریم دەکرد، لەگەڵ بـراکەی یەکترمـان ناسی و لە ماوەیەکی کەم بووینە برا، هاتوچۆی ماڵیانم دەکرد، ئەو خوشـکەی، هەیدێ، نـازانم هەوکە، گەنجـی ئەو شـارە بە هەمـوو دینەکـانەوە، بـۆی دیـن و سـەرگەردان بووبـوون، هەمـوو لە بەر خۆیانەوە، ئەمەیان دەگوتەوە:

**گوڵەندام، ئەی تەنافی گەردنم، زولفی پەرێشانت...**

هەر کەسێ گـوێی لەوە دەبـوو، دەیزانـی بـۆ گوڵەنـدامی کـچە جووە، گەنـج هەبـوو کێچەڵـی پێیـدەکرد، مـن جارێـک لە سـەر وی تووشی شەڕێکی گەورە هاتم، چەقۆیەکیشم خوارد، ستی، نووستی، گوێت لێمە؟

ستی پێدەکەنێ:

ئێ، لە سەر گوڵەندام شەڕە چەقۆت کردووە، لۆیە...

کەریم:

ئا، وابزانم، بە هۆی ئەو شەرەوە بوو، بە هەڵە تێمگەیشت و خۆی زۆر لێم نزیکدەکردەوە، منیش هەمیشە پێمدەگوت:

من خوشکی لە داکێم نیە، تۆ خوشکم بە.

ئیدی زۆر هاتە پێش، ئەو چەندی دەهاتە پێش، من دوورتر دەکەوتمەوە، هەوکەشـ پێوە دەستم بە دەستی نەکەوت، هەر بە خوشکێ گازمدەکرد، جارێک گوتی:

دەزانم دین رێگرە، تۆش لەبەر هەندێ خۆ دوور دەگری، بەڵام لای من گرنگ نیە، هەر کەس لە سەر دینێ خۆ و...

گوتم:

خوشکێ، من کێشەی دینم نیە، لە چاوی خوشک و برایەتی بترازێ، ناتوانم بە چ چاوێکیدی لێت بڕوانم.

ئیدی وازی هێنا و تەمابڕ بوو.

ستی:

وەیش، چەند گوناحە، بەڵام وا بزانم، بە دەستگیرانە.

کەریم:

بە ڕاست؟ ئەوەم پێخۆشە، کووت زانی؟

ستی:

خـۆی وای گـۆ، بەڵام دیـارە بە هـۆی پرسـەوە، زەماوەنـدیان دواخستووە، ئەرێ کەریم بە من بڵێ، دین لۆ ڕێگرە لە...

کەریم:

سـتی گیـان، بە خـودای مـن شـارەزاییم لەو شـتانە نـیە، هێنـدە دەزانم لەو شارە، ژنخوازی نیە، لە نێوان موسڵمان و جوو و دیان و ئێزیدیدا نیە.

ستی:

ئەدی ئەوین؟

کەریم:

ئەوین کە سەریکرد، چ دینێ ناتوانێ ڕێی پێبگرێ.

لەگەڵ دەنگی مەلا وەئاگا دێن، بە بێزاری خۆیان کۆ دەکەنەوە، وا دیـارە هەردووکیـان خەونـی زۆر ناخۆشـیان دیتـووە، بەڵام بـۆ یەکتـری نـاگێڕنەوە، کەریـم چاوێـک بە دەوری خۆیـدا دەگێـڕێ هەرچەندە تاریکە، بەڵام دیارە دەیانناسێتەوە:

ستی، دەزانی ئێمە ئەوشۆ لە سەر گۆڕی حەسەن و مریەم خەوتین.

ستی:

بەختەوەرن، گۆڕیان بە تەنیشت یەکەوەیە.

تاو تازە کەوتووە، ئەوان لەدەرێی شارن، کەریم پرسی:

- ئەرێ گوندەکە ناوی...

+ حەسارۆکان.

- هەرچەندە ئاقاری مەترسیمان بڕیوە، بەڵام هەر وا باشە لە تاریکی بچینە ناو ئاواییەوە، نزیکە، دەبێ لەو ئاقارە بمێنینەوە، باشە جۆگە ئاوێ لەو سەرە هەیە.

+ وا دەکەین، تۆ هەموو شوێنێ پێدەزانی.

- من لەو لایەوە تا بن ماڵی مەلای گەورەم دیوە.

+ من تا ئێرەم دیوە.

- پەلەت نەبێ دنیات پێدەکەم، دەچینە سەر چیای وا، ئاشیبا لە چاو وی گردۆلکە بێ.

+ باشه، ئەورۆ لەو ئاقارە دەکەینەوە، ئێوارە دەچینە ئاوایی، دیاریەکەی بۆ تۆشم داناوە، وا لەوێیە، وای چەند حەزدەکەم بە دڵی من نەخشاندبێتی.

– بە دڵی تۆ دەبێ، ئەها، ئەو چیا بڵندێهێ دەبینی؟

+ سەفین دەڵێی...

– ئا، کوو زانیت، سەفینە؟

+ ئەدی لە سەر ئاشیباوە نەتگۆت...

– با، بەڵام لەو دوورەوە...

+ ئەو جارەی چوومە سەر قەڵاتێ بۆ ماڵی کچە نەخشکارەکە، لەوێوە دیتم و گۆتیان ئەوە سەفینە شێتەیە، ئەرێ لۆ شێتە؟

– با بگەینێ، هەینێ دەزانی.

+ ئێمە دەچینە ئەوێ؟

– ئا، دوای ماڵی مەلای گەورە، دەدەینەوە رێی ئەوێ، لەوێ لە سێبەری داربەڕوویێک دەچینە ئامێزی یەکتر و...

+ کەریم، بگەینە ئەوێ، دەستیان نامانگاتێ، ترسمان نامێنێ؟

– ترسی چی، نەک برایمۆک، مەلیکیش نایگاتێ.

+ گۆتەی: پشتم سەفین بێ، تف لە ئاسن دەکەم.

بۆ ئێمەش دەبێ؟

- ستی، ئەو گۆتەیە، ڕێک بۆ من و تۆ گوتراوە.

+ کەریم، دوورکەوتنەوە لە وار و زێد سەختە، وا نیە؟

- سەختە، بەڵام تۆ بڵێ چار چیە؟ خەمت نەبێ، رادێین، ئەو کوێستانانە ببینی دەستبەرداریان نابی.

+ چار نیە، رادێین...

- دێینەوە، ستی دێینەوە، زۆر نابات، بە یەک دوو منداڵەوە دەگەڕێینەوە.

+ دڵی تۆ وا دەڵێ؟

- خۆ ناڵێی دڵی من وا ناڵێ! ستی، کاتێ لە شوێنێ گیرساینەوە، ئەسپێکی ڕەسەنیش دەبینینەوە و ماینەشێی لێ چادەکەین، تا جووانووەکی وەک خۆی لێ بکەوێتەوە...

+ نیە، کەریم نیە، لە دنیایێ پێناچێ ئەسپێ هەبێ، شایانی شێی من بێ.

_ منیش وا دەڵێم، ماینەشێ و خاوەنەکەی دوو تاقانەن لە دنیایێ، نە چ ئەسپێ، نە چ پیاوێ...

ستی ناولەپی ناسکی کە لە پەلکی گوڵەباخ ناسکتر و نەرمترن، دەخاتە سەر زاری کەریم و دەڵێ:

بۆ ماینەشێ وایە، بەڵام بۆ ستی نا، من پیاوێکم گڕداوە، لەو دنیایە بێ هاوتایە.

لە سەر گۆمیلکە ئاوێ، ئەو جۆگەلەیە وێدەچێ لە بن زوورگەوە، لە بەری کانیی دڵۆپەوە بێ، لە سێبەری ماینەشێ، لە تەنیشت ئێکدی دانیشتوون، جلکی عەزیزی داکەند و بۆوە ستی! سوخمەکەی هەر لە رەنگ نا، لە بۆنیش گوڵە هەڵاڵەیە، زەرد زەرد، بۆنی سوخمەی هەڵاڵەیی، کەریم سەرمەست دەکات، روومەتی ستی لە بن سێبەری ماینەشێ، لە چاوی کەریمەوە دەڵێی گوڵە سوێسەنە، لە هەر نیگایێ رەنگێ دەگرێ، کێ هەیە خۆی لە راست ئەو روومەتە رەنگاڵەییە راگرێ، ستی کەزیی تۆپ کردووی بن مشکیی سەری کردەوە، کردنی سێ بەنگی، بەڵام چاوی نەرِشت، چاوی ستی بێ کل و دەرمان، بێوەی بیرِێژێ، خێڵێ شوان و ئاغا دەکوژێ، هەر کاتێ ستیت دەدی وات هەستدەکرد، ئێستا لە بەر ئاوێنە هەستاوە و کلدان و کلچووکی داناوە، چاو نیە لە دنیایێ وێنەی چاوی ستی رەش و گەش، کەریم چاو لە چاوی دەبرِێ:

کیژێ، وێدەچێ گوڵە گەنمی رەژگوڵ، پرژی خۆی لە برژانگی تۆ خواستبێ!

ستی، رەفتە مۆرەکەی کە دەڵێی لە وەنەوشەی چنیوە، لە سەر دەبەستێ و دەڵێ:

ما چاوی خۆی نەدیتووە دەڵێی...

کەریم دەست دەخاتە ئەستۆی ماچێکی نەرمی چاوی دەکات، چاو دەکەوێتە سەر گەردن و سینە، گەردن دەڵێی کێلە، دەڵێی گەردنی نیفەر تیتیە، سینە کار لە پەنیر و کوارگی کەما نیە، کەریم خۆی پێناگیرێ، لێو دەبزوێ و پەنجە دەگەڕێ، ماینەشێ دەحیلێنێ، حیلەکەی لەو حیلانە نەبوو کە کەریم پێشتر لێی بیستبوو، دەپرسێ:

ستی، ماینەشێ چی گۆ؟

ستی هەستا و دەڵێ:

گۆتی: من حەزم لە گەوزینە، ئێوە مەگەوزن.

ستی روو لە ماینەشێ:

ئێستا دەگەینە ئاوایی، ئێرە جێی گەوزینی نیە.

سواربوون.

رۆژ بە سەر قەڵاتدا لاربۆتەوە، ئاودیو بوو، زەردەی ماوە، هۆ حەسارۆکان، ماینەشێ بە دوو ئەویندارى تەرەوە هات، پەنایان دەدەی!

## ٢٥

من نەمزانیبوو ئەوان بەرەو ماڵی ئێمە بەڕێوەن، بەڵام وەک بڵێی دڵم تریواندبی، هەمیشە چاوەڕێیان بووم، دڵم سەیار بوو، چاوم لە ڕێی ڕۆژاوا، لە ڕێی شار بوو، دەمگۆ ئێستا نا دەمێکیدی ماینێ دێ، دوو سوار بە سەر زینەوە، هەواڵی ئەوان و ماینەشێ دەمێک بوو گەیشتبووە ماڵی ئێمە.

ڕۆژ زەردەی مابوو، لە سیلەی ماڵی خۆمانەوە، دوور زۆر دوور سوارێ دەرکەوت، دڵم گۆتی، ئەوانن.

گەلەک نەرم دەهاتن، چووم بە داکمم گۆت:

دایە، دڵم دەڵێ، ستی و کەریمن.

داکم گۆتی:

دڵی تۆ درۆ ناکات، با بچینە سەر ڕێ.

بوولێڵە، نزیکبوونەوە، وەک تارمایی دیارن، هەوبن هەو نین، بۆ دڵنیایی گوتم:

ئەوە بۆ دیاریەکە هاتن؟

گوێم لە دەنگی سوارکردنی چەک بوو، لەگەڵ سوارکردنەکە:

نەکەی کوڕە، ئەوە...

دەنگی ستیم ناسیەوە، گوتم:

ستی، گیانەکەم، ئێوە...

بە ئەسپایی هاتینە ماڵێ، بابم گوتی:

ئێرە ماڵی خۆتانە، تا پێتان خۆشە، دەتوانن بمێننەوە، وا باشە مایندشێ کەس نەیبینێ، چوونکێ ئێوە هێندەی بە ماینەکە دەناسرێنەوە بە خۆتان نا، هەرچەندە ئێرە دوورەدەستە و ئاغا رێی بەو ناوە ناکەوێ، بەڵام هەر باشە...

خزمێکمان لە سەری گەڕەک تەویلەیەکی گەورەی هەبوو، ماینەشێمان بردە ئەوێ و خەمبڕاو بووین.

ستی بەر لە هەر شتێ لە دەسرۆکەی پرسی، کاتێ نیشانم دا، پێی شاگەشکە بوو، گوتی:

نەمدەزانی ئەو دەستەخوشکەی تۆ وا دەستڕەنگینە، بەڵام ئەوەی خراپە، لە چاوی من جوانتر نەخشاندوویەتی.

راستی، دوو چاوی سەر دەسرۆکە گەلەک جوان بوون، ژن نیە خۆزی نەخوازێ دوو چاوی لەو شێوەی هەبێ، بەڵام چاوی ستی زۆر لەو دوو چاوەی سەر دەسرۆکە جوانتر بوون.

ستی گوتی:

ئەو چاوانەم بۆ کەریمە، با لێرە بڕۆین هەینێ نیشانی دەدەم، دەمەوێ لە چۆلەوانی، کاتێ هەر من و ئەو دوو بەدوو بین، بیدەمێ

گوتم:

تا بە ماچەوە لێت وەرگرێت.

گوتی:

زۆر دەترسم...

گوتم:

لە چی دەترسی، کێ دەستی دەگاتە ئێوە؟ بە من بڵێ زگت نیە؟ پێکەنی:

زگی چی، تا ئێستا تفەنگ لە نێوانمان دەخەوێت، تا مەلایەک...

من سەرم لەو خۆڕاگریەی ئەوان سوڕما، ئەو هەموو دەمە بەیەکەوە بن و ستی هێشتا کچ بێ!

سێ شەو من و ستی بە یەکەوە لە سەر یەک جێ، دەست لە ملی یەکتر خەوتین، ستی ئەوینی خۆی بە شێوەیەک دەگێڕایەوە، من تا ئێستاش باوەڕ ناکەم دوو کەس هەبن بەو رادەیە یەکتریان خۆشبوێ، خۆشەویستیی ستی و کەریم لە سەر زەوی هاوتای نیە، نازانم لە ئاسمانێ.

ستی ورد و باریک، سەربردەی ئەوینی خۆیانی بۆم گێڕایەوە، کانی ئەوین و پێش کانی ئەوین، لە سەری ئاشیباوە بۆ گردی پیرداود، لەوێوە بۆ سەر قەڵات و سەر گۆڕی عوزێر پێغەمبەر و حەسەن و مریەم، هەموو هەر هەموو، ئەوەی لە منتان بیست هەر هەمووی.

کەریمیش کەمێ سەربردەی خۆیانی بۆم گێڕایەوە، کاتێ زانیشی من گوڵدۆستم، تۆزێ تۆوی گوڵی دامێ، گوتی:

ئەو گوڵە چ لە شێوە، چ لە رەنگ، چ لە بۆن لە چ گوڵان ناچێ، ناوی گوڵەستیە، لە رەشەمێ بیچێنە، لە خاکەلێوە دەڕوێ و لێو دەکاتەوە و بە بۆن و جوانی خەنیت دەکات.

ستی زۆر خەمی ماینەشێی بوو، دەیگۆ:

لێم دوورە، زۆر لێم دوورە.

من پێی پێدەکەنیم و دەمگۆ:

کچێ دووری چی، هەر هێندەی کەریم لێت دوورە، ئەوەتە بستە رێیەکە.

دەیگۆ:

دڵم دەڵێ، زۆر دوورە، با لە بن دەستم بێت.

دەستم بشکێ، ستی گیان، ئەگەر...

کەریم و ستی سێ شەو لەماڵی ئێمە مانەوە، وای ڕۆژی سێیەم، بریا ئەو ڕۆژە لە ساڵ نەبووایە!

بنووسەوە داستاننووس، بنووسەوە، لە سەر زاری کچە پلکی ستی بنووسەوە، وشەیێ بپەڕێنی، لێت خۆش نابم:

لە سەر نان خواردن بووین، ژنێک بە پرتاو هات:

چوار دەوری دێ بە تفەنگچی گیراوە، دەبێ چی قەومابێ؟

کەریم دەستی دایە تفەنگ و گۆتی:

ستی گیان خۆ خڕکەوە، زوو بگەینە ماینەشێ.

بابم گۆتی:

بوەستن کوڕم، کێ دەڵێ بۆ ئێوەیە.

ستی:

بۆ ئێمەیە، خەونم دیوە.

نازانم خەونەکەی ستی چ بوو، بەڵام خەونەکەی ئەو شەوەی خۆم لە ڕووداوەکە ڕوونتر لە یادە:

دایکم تەشتێکی زۆر گەورە، هێندەی جێ جۆخینێ، خەنەی گرتبۆوە، ژن و کچی ئاوایی بە دەوریدا دەسووڕانەوە، دەست و

کەزییان لە خەنە نابوو، لەو خەونەی من، خەنەبەندانێ بوو، نەبووە و نیە و نابێتەوە...

وەک پەلیک دەرپەڕین، تفەنگچی گەیشتوونەتە ناو ئاوایی، من پێشیان کەوتم بەرەو تەویلەی ماینەشێ، ئەولا گیرابوو، تفەنگچی دامەزرابوون، سووڕانەوە، کەریم و ستی زۆر بەغار بوون نەیان دەگەیشتمێ، کەریمیش تەقەی کرد، شەڕ گەرمە، خۆم داوەتە بن دیوارێک.

کەریم و ستی شان بە شانی یەکتر دەڕۆن، تەقەیان لە سەرە و تەقە دەکەن، من بن دیوار و بن دیوار لە دوایانم، چاوم لە سەریانە، لە پەرگەی ئاوایی خۆیان هاویشتە چاڵاییەک، گوێم لێیە ستی دەڵێ:

تفەنگەکە بدە من.

کەریم دەڵێ:

بوەستە، بۆ خۆمیان لێگەڕێ.

کەریم سێرەی لە پێش خۆی گرت و چەند فیشەکێکی هاویشت، لەو لاوە تەقە بڕا، ڕێی کردەوە، هەڵاتن، کەریم پشتاو پشت دەڕۆیشت و تەقەی دەکرد، دوو تفەنگچیم دیت، لەو گۆڕە کەوتوون، بەڵام دەجووڵێنەوە و نەمردوون، تفەنگچی زۆرن و دوایان نایێ، کەوتنە دوایان، من و سێ چوار کچی دێ کەوتینە دوای تفەنگچیان، سێ چوار فیشەکیان بە سەرماندا تەقاند، بەڵام ئێمە

نەگەڕاینەوە، هەر هێندەم زانی لە پێش ئێمە تفەنگچیەکیدی بەر بۆوە، یەکیتریش...

ئێرە ئاقاری شاربزرە، بنووسەوە، داستاننووس، لە زاری من، لە زاری دیدڤانێ بە سەر سەربردەی ئاقاری شاربزرەوە بنووسەوە، یەک وشەی بپەڕێنی، گەردنت ئازاد ناکەم.

تا ئێرە تفەنگی کەریم ناوە ناوە گوللەیەکی لێوە دێت و شەش تفەنگچی پێکاوە، بەڵام پێناچێ هیچیان، بە جێی مردنیان بکەوێ، من بە سێ دەنگا گازدەکەم و دەنگم ناگاتە کەریم، گازدەکەم:

کەریم، بتەقێنە، دەست مەپارێزە، وا نەکەن دەرناچن.

دەبینم، لە دوورەوە دەبینم، کەریم دەکەوێ، ستی تفەنگی لێ وەردەگرێ و لەو دوورەوە دوو فیشەکان دەهاوێژێ، لە نزیک من تفەنگچیەک هاواری لێ هەڵدەستێ، دەبینم، ستی چووە سەر کەریم، وێدەچێ برینەکەی ببەستێ، پاش تۆزێ، کەریم هەردەستێتەوە و تفەنگ لە ستی وەردەگرێتەوە و بەڕێ دەکەونەوە.

دەبینم، کەریم و ستی دەستی چەپیان گرت، بە ناو چۆمەکەدا بەرەو رێ، رێی ترومبێلان غاردەدەن، ترومبێلەک دیارە، منیش وا تێگەیشتم ترومبێلی پۆلیسە و بە هانای ستی و کەریمەوە هاتوون، تەقە برا، گوێم لە دەنگی ستیە:

بتەقێنە، کەریم، بتەقێنە.

چاوم لێیە، کەریم، پل پێوە دەنێ و چ دەنگیش نایێ، تێگەیشتم، تفەنگ راوەستایە، گوێم لێیە ستی دەڵێ:

((برایماغای بێ دینە

سواری قەمەرەی شینە

کەریم، دەستان هەرینە))

دەستی چ هەرینێ! تفەنگ جۆتی کردووە و بۆتە گۆچان.

بنووسەوە، داستاننووس بنووسەوە، داستانی خوێن بنووسەوە، شاربزر بنووسەوە.

تفەنگچی کە زانیان تفەنگی کەریم لە کار کەوتووە، چوار دەوریان دان، من هێشتا دوور بووم، دەنگی دوو تەقە هات و کەریم کەوت، چۆکم شکا، بە گاگۆڵێ لێیان نزیک بوومەوە، گوێم لێیە تفەنگچیەک دەڵێ:

ستی وەرە سوار بە، تۆ ناکوژین.

بابی ستی دەڵێ:

ئاغا، هەرێمان وا نەبوو، من کەریم بکوژم و تۆ ستی؟

ئاغا دەڵێ:

دوورکەوە، کاری تۆ تەواو.

دەبینم ستی سەری رووتە، رەفتەکەی وا بە رانی کەریمەوە، ستی خوێنی کەریم لە سینگی خۆی هەڵدەسوێ دەڵێ:

ئاغا، گەوادی مووسڵێ، من پشتی کەریم، ژیانم ناوێ، لەگەڵ وی دەچمە ناو گڵێ.

ئاغا دەڵێ:

کەس دەست لە تۆ نادات، دەزانم هەر کچەکەی ئاوایی، دەتبەمەوە ماڵێ و...

ستی کە خۆی بە سەر تەرمی کەریم دادابوو، هەستایەوە و بە دەنگێک کە لە ئاقاری شاربزر دەنگیدایەوە:

برایمۆکی گەواد، تەرەسی دنیایێ، من منداڵی کەریمم لە زگدایە، لەو دنیاش هەر دەبمەوە ژنی وی.

ستی روو لە ئاغا، سینگی خۆی دادڕی و بە دەنگێک لە شاربزرەوە گەیشتە قەڵات و منارەی چۆلی و لەوێوە بە دنیادا بڵاو بۆوە:

تەرەسی بابەلباب تەرەس، دەمانچکەت بتەقێنە.

بنووسەوە، داستاننووس بنووسەوە، خوێنی گەرم بنووسەوە، گریانی ماینەشێ و قژڕنینەوەی من و راسپاردەی ستی بنووسەوە.

من بە گاگۆڵێ و مایندشێ بە فڕین گەیشتینە سەر کەریم و ستی، ئێستاش نەمزانی کێ مایینی گەیاندە ئەوێ، ستی سەری لە سەر سینەی کەریم بوو، ماین لمووزی خستبووە سەر سینەی ستی، هۆن هۆن فرمێسکی دادەباراند، حیلەیەکی گریاناوی وای لێوەدەهات، چ ژنێک، بە دایکی ستیشەوە نازانێ وا بگریێ.

ستی زمانی شکابوو، لێوی دەجوولا، چاوی هەر وەک خۆی، دەستێکی دەجوولا، بە ئامازەی چاو و پەنجە تێگەیشتم، شتێک لە بەرکی کەوێکەیەتی، دەرمهێنا، دوو چاوە جوانەکەی خۆی بوون، دیسان بە چاو و پەنجە کەوتە ئامازەکردن، درەنگ تێگەیشتم کە دەسرۆکەکە لە بژی مایندشێ گرێدەم، دەستم خستە سەر سینەی تا دەسرۆکەکەی سەر سینەشی دەربهێنم نەیهێشت، بە چاو گوتی:

جێی ئەو دەسرۆکەیەم سەر سینەیە.

لێوی جوولاندەوە، زۆری لە خۆی کرد، کەرتکە دەنگێکی لێوە هات: کـــ...

داستاننووس، تۆ چۆن دەتوانی، هاواری من و حیلەی مایندشێ بنووسیەوە؟

من وەک خەون دێتەوە بیرم، ڕەفتەکەی ستیم لە ڕانی کەریم کردەوە، بە خۆشم نەمزانی بۆ وام کرد.

ترومبێلی پۆلیس گەیشت، دەسرۆکەم توند لە بڕی ماینەشێ گرێدا، ماین کەوتە دوای کەریم و ستی، من لە ستی ئومێدبڕ نەبووم، هەستمدەکرد دڵی لێدەدات.

داستاننووس، لەبیرمەکە، سەرکارە سەگسارەکەی ئاوایی لەبیرمەکە، ئەوەی بەکرۆکە لە چاو وی، بە ئاوی کانیی دڵۆپە شۆراوەتەوە، رۆژی دوایی هەموو ئاوایی، تێکەیی خوێنی کەریم و ستی لە ئەستۆی ئەوە، ئەو سەرکارە، بۆ مستێ پارە، زمانی لە ئەوین دابوو، ئەو سەرکارەی ئەویندارانی سەر دەنێنەوە ئەو هەر وا دەژی.

داستاننووس، وەرە بچینە شوێنی خوێنی ئەوین، کەڵەکە بەردێکم لەوێ هەڵناوە، رەفتە خوێناویەکەی ستیم هەڵداوە، ئەو رەفتەیەی لە رانی کەریمی بەستبوو، بیست ساڵە با لێیدەات، هێشتا تەڕە، داستانووس، تۆ ئەو رەفتەیە بنووسەوە، داستاننووس، لە خاکەلێوان سەر لە شوێنی خوێنی ئەوین بدە، گوڵەستی ببینە و بۆنی بکە کە بەدەستی خۆم لەوێم چاندووە، تۆ گوڵەستیەکەی کەریم بنووسەوە.

## ٢٦

**هاوارتە لە من، ماینەک وا دێ**

**نە دوڵدوڵی عەلی**

**نە رەخشی رۆستەم**

**نە شەودێزی خوسرەوی پەروێزە**

**ماینەک هات، ماینەشێیە**

**دڵ بە سوێیە**

**وەک باز دەفڕی**

**وەک ژن دەگری**

**خوێنی کەریم و ستی، بە یال و شانەوە**

**هاوارتە لە من**

**لە چاوانی دێ فرمێسکی خوێنین، سێ ڕێز سێ ڕێزە...**

ئەو ڕۆژەی شار، نەک من بە پلکە سندوسیش ناگێڕدرێتەوە، کاتێ هەواڵی کوژرانی ئەوین بە شاردا بڵاوبۆوە، وەک ئەوەی دنیا سەراوبن بێت، وابوو، کاتێ گەیشتمە بەر دەرکی سەرا و

خەستەخانە، هەینیێ لەو بەری سەرا بوو، بەرانبەر سینەماکەی ئێستا، دەمدی ژن وەک سەرخۆشان بە لادا دێن، سینگ دەکوتن و بە ئاوازی کوکووختی سەردوولکان دەڵێنەوە:

**ئاخ لە فەلەک، واخ فەلەکێ**

**کوو دڵیان هات، دەستیان بشکێ**

**وای شێرە، کەریم شێرە**

**شین و رۆڕۆ لە هەولێرە**

**وای شێرە، ستی شێرە**

**شین و رۆڕۆ لە هەولێرە**

شار هەموو رژاوەتە پێش سەرا و خەستەخانە، شار دەڵێی خۆڵ و دۆی بە سەردا کراوە، شار بە شێوەیەک تاساوە، لە سەردەمی عەشتارەوە تا ئەوە رۆژە وا نە تاساوە.

من خۆم گەیاندە سەر تەرمی ستی، هەموو گیانی خوێن بوو، سەرم هەڵداوە، دەتگوت خەوی لێکەوتووە، ئەو چاوانەی بە دەستی خۆم لە سەر دەسرۆکە نەخشاندبووم، بۆ هەمیشە خەوتبوون، دەستی راستی لە سەر سینەی خوێناویی دانابوو، دەسرۆکەیەکی خوێناوی توند گرتبوو، وا تێگەیشتم چاوەکانی خۆی بن، هەو نەبوو، بەرگەم نەگرت و بە لە خۆدان دوورکەوتمەوە.

دوو ئەویندارى بێ کەسوکار دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە، لەو دوو ڕۆژە شار بە دەوریان دەخولایەوە، نزای گەیشتنە بەهەشتی بۆیان دەخوێند، تووکی لە بەکرۆکە و بکوژان دەکرد، سەری سێیەی هاتن، کەریمیان هەڵگرت، گوتیان دەیبەنەوە بۆ ئاوایی خۆیان بۆ بن دوندی ئاشیبا، ستی مایەوە، کەس بە دوایدا نەهات، شار هەڵیگرت، هەرچی ژنە وا بە دوایەوە، سوڵتان مزەفەر هێندە ژنەی بە دواوە نەبووە.

دەفزەنەکەی سەر قەڵاتێ، ئەو ڕۆژە لە شار نەبوو، دەنا لێنەدەگەڕا، بێ حەی حەی و دەف بنێژرێ، ئاخر ئەو حەسەن و مریەمیشی بە سەمای دەف و چریکەی خۆیەوە ناشتبوو، لە ڕێی گۆڕستانێ، شار هاواری دەفژەنەکەی دەکرد:

دەفژەنەکەی دڵ پەمۆیی

دادێ، هاوارێ، هەوایێ

خاتوونەکەی ئەوین ڕۆیی

دەنگی دەفت بۆچی نایێ؟

شار، ستی برد و لە نزیک حەسەن و مریەم ناشتی.

داستاننووس، ئەو ڕۆژەی شار، چاوەکانی ستی، بە من ناگێڕدرێتەوە، بە تۆ نانووسرێتەوە، داستاننووس، ماینەشێی ستی کە چارچاو بووبوو، دڕی بە خەڵکەکە دا و بۆنی خوێنی کەریم و

ستی کرد و به بەری منارەی چۆلیدا باڵی گرت و نەمزانی چی بە سەرهات، لە داستانان جێی نابێتەوە.

داستاننووس، گوڵەندامی شاجوانی شاریش، لە وڵات نەما، تا لە ڕێزە فرمێسکی ئەوەوە، چەند دێڕێ لە داستانی خوێن بنووسیەوە، ئەو کچە جووە هێندەی بۆ کەریم گریا، بۆ برا جوانەکەی نەگریا، کەریمی زاری وی، وەک کەریمی زاری کەس نەبوو، کەس لەو رازە نەگەیی، کچە جووێ بۆ کوڕە موسڵمانێ وا فرمێسکان هەڵوەرێنێ و پێیدا هەڵبڵێ، چ خوشکێ بۆ برای خۆی وا سینگی نەکوتاوە:

چەندم گۆ کەریم مەچۆ ئاقاری

لێرە دانیشن، لۆ خۆ لە شاری

من لۆتان دەکەم شەو تۆبەتداری

منت بەجێهێشت لۆ شین و زاری

هاوار خودایە، هاوارە مووسا

بەژنێ کەریمم لە خوێنا خووسا

لێوم هیشک بوو، دەنگێ من نووسا

ستی............

داستاننووس، بە دوای گوڵەندامدا برۆ وڵاتی جووان و بیبینەوە، ئەو سەردوولکە خوێناویانەی بۆ کەریمی هۆنیبووەوە و لەگەڵ خۆی بردنی، بیانهێنەوە، بیانخە داستانی خوێنەوە.

داستاننووس، وەرە وێکڕا سەرێک لە گۆڕەکەی ستی بدەین، بەڵکی لەوێ، زاری گێڕانەوەم ببێتەوە.

داستاننووس، من بیست ساڵە لە سەر دەسرۆکەیێ لەگژ چنینی ماینێکم لە حیلەیەوە خوێن پڕووشە دەکات، رەنگە ئەو نەخشەی ماینەشێ، بۆ بەرگی داستانەکە بشێ.

## ٢٧

**بلێنە قەرەچووخ**

**کەوی نەخینێ**

**کەریم و ستی سۆر بوون لە خینێ**

حیلەیێ هات، چ حیلەیێ، دەتگوت خورەی خوێنە، دڵم کەوتە کوتەکوت، لێرەوە پسام، چۆکم شکا، لە سەر دەست چوومە دەرێ، هەو بوو، ماینەشێ، سەری بە سینگمەوە نا، پێکەوە گریان، گرێی دەسرۆکەی بژیم کردەوە، دوو چاوی ستیم خستە ناو چاومەوە.

ماین حیلەیەکی کرد، بە حیلەی مالآوایی دەچوو، من هەر هێندەم ئاگا لە خۆم بوو، سەری لە دایکی کەریمیش دا، لەوێوە بە رێی ئاشیبادا باڵی گرت، لەوێوە نازانم بەرەو کوێ، ئیدی بووە خەونی شەوان، خەونی مزگێنی.

داستاننووس، وەرە، پێکەوە سەرێک لە جێی گۆڕەکەی کەریم بدەین، ئەوەی بەری بیست ساڵ، تەنها یەک شەوی تێدا مایەوە، گۆڕی لە سەر خۆی هەڵدایەوە و نەما، دەڵێن چۆتەوە کن کچەکەم، کن ستی.

ئا، داستاننووس، داکی ستی راست دەڵێ، ئەو رۆژەی کەریمەکەی منیان هێناوە و لێرە شاردیانەوە، شەوەکەی، خودا

بابی دیدارێکی کورتی کوڕەکەم خەوی دامێ، لەو خەونە دەستی خستە سەر شانم:

+ هۆ دا.

- گیانی دایە.

+ من لێرە نابم، ستی بە تەنێیە، دەچمە لای وی.

- بڕۆ کوڕم، منیش ببە.

سبەی زوو، هێشتا، ڕۆژ گزنگی خۆی نەدابۆوە لە ئاشیبا، گەیشتمە سەر گۆڕەکەی، وەی خوایە! گۆڕ هەڵدرابۆوە، کەریم نەمابوو، نەیبردم، بیست ساڵە منی بە تەنێ هێشتەوە، بنووسەوە، بەژنێ کەریمم جوان بنووسەوە، تفەنگێ کەریمم...

داستاننووس، درەنگە، هەوکە نا، پاشان هی داکی کەریم بنووسەوە، وەرە، وێکڕا بچینە سەر گۆڕی برایمۆکی گۆڕبەگۆڕ، لەوێ من چیم گۆت، تۆ بینووسەوە، داستاننووس، چاوی ستی، حیلەی مایینەشێی ستیش لەبیر نەکەی، بە ئاوازەی خۆی، حیلە حیلە بینووسەوە.

وەبیرمدێ لە گەڕەکێ مە، ناوی کەریم و ستی لە ریزی مەم و زین و خەج و سیامەند و ئەوانە دەهات، سەربردەی ئەو دوو ئەویندارە لە سەر زاران بوو، منیش هەندێ لەو بەندانەم ئەزیەر بوو کە بەندبێژان پێیاندا هەڵگوتبوون، لە دڵێ من داستانی کەریم و ستی لە خڕ داستانان دڵنشینتر بوو، حەزمدەکرد کەریمەکە من بام!

سەربردەکە هی سالانی چلەکانە، من لە حەفتاکان چەند جارێ چوومە شوێنی رووداوەکەش، لای ئەو کەڵەکە بەردانەی کە هەستمدەکرد دێنە زمان و کۆتایی داستانەکە دەگێڕنەوە.

دەمێ بوو خولیای گێڕانەوەی ئەو داستانە لە سەرم دەگەڕا، باش بوو لە رۆمانی (مانەشێی ستی) هاتەدی.

**کافکاف**